ژمارە ٧ ئابی ١٩٨٩

# نووسەری کورد

محمەد بەحری سەر نووسەر جێگری سەرنووسەر

سکرتێری نووسین:مەحموود زامدار

دەستەی نووسەران

د. نافع ئاکرەیی
عبدالکریم فندي
عبدالرزاق بیمار
عبدالوهاب تاڵەبانی
تیلي امین علي
فریا عبدالله جاف
عبدالخالق سەرسام

- عوسمان پیرداود

دەرهێنانی هونەری - ئازا حسیب قەرەداغی

سەرپەرشتی چاپ - ئەحمەد رەسول پشدەری

* *

- ئەو نووسینانەی دەگاتە گۆڤار نادرێتەوە خاوەنەکەی،جا گەر بڵاوبووەوە یان نەبووەوە.
- نووسینەکان زادەی بیرکردنەوەی خاوەنەکانیانن.
- دانانی نووسینەکان بەپێی پێویستی هونەرییە.

* *

---

ناونیشان: بەغدا ـ گۆڕپانی ئەندەلوس ـ یەکێتی گشتی ئەدەیب و نووسەرانی عێراق ـ نووسەری کورد.

---

لەم ژمارەیەدا

## خوێنەری ئازیز

● وا بزانین ماڤ رەوای خۆتانە کە گلەیی‌مان لێ بکەن لەبەر ئەوەی « نووسەری‌کورد » دوا کەوت. ئەوە حەقی خۆتانەو ئێمەش داوای لێبوردتان لێ ئەکەین ئەگەر بیانەوێ لێمان ببورن. بەڵام ئەتوانین بەڵێنتان بدەینێ کە لەمەو دوا ئەو پەڕی هەوڵ ئەدەین بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی رێک‌و پێک بە چاپی بکەیین‌و ئەو بۆشایی‌یە پڕ بکەینەوەو وەکو جاری جاران « نووسەری کورد » بە ئێوەی بەڕێز بگات‌و لە خزمەت کردنی ووشەی کوردی رەسەن بەشدار بکات. بە تایبەتی لەم کاتەدا کە ولاتەکەمان لە سێبەری ئاشتی‌و سەرکەوتندا ئەژی. ئەو سەرکەوتنە مەزنەی کە بە هۆی رابەرایەتی سەرۆکی مەزن صدام حسین، خوا بیپارێزێ، هاتە کایەوە..

● گۆڤاری « نووسەری کورد » گۆڤاری هەموو رۆشنبیرو ئەدیبێکی کوردە و باوەشی بۆ هەموو وشەیەکی پاکو رەسەن ئەکاتەوەو چاوەڕوانی ئەوەیە کە نووسەرانی کورد بەگشتی بەشداری تێدا بکەن‌و بە هی خۆیان بزانن.

● دەستەی نووسەران بریاریان دواە کە بە بۆنەی دەیەم میهرەجانی مەربەد ژمارەیەکی تایبەتی بە زمانی عەرەبی بە چاپ بکەیین جا لە بەر ئەوە داوالە گشت ئەو ئەدیبانە ئەکەین کە توانای نووسینی عەرەبی‌یان هەیە بە زوترین کات بەرهەممان بۆ بنێرن بۆ ئەوەی بتوانین ئەو ژمارەیە بەرێک‌و پێکی بە چاپ بکەیین.

ئیتر لە کۆتایی‌دا هیوادارین کە بتوانین لەم کارەدا سەرکەوتوبین‌و دیسانەوە داوای لێبۆردن ئەکەین.

دەستەی نووسەران

# وێنێت رومانەکا نی

نافع ئاکرەیی

( ١ )

د باغەکێ فەریکو بێوێنەدا
رەنگێت جوان
دگەل شالیلا
لە بەر حەوشا بایێ شەمالێدا
شەر دکر..... !
بایێ پاکژ... دگەل سیلاڤا
دونیا خوشدکر
لێ پا گەلو....
ئەڤان هەمیا... پشیا من تەنگدکر
ترپێت دلی راوەستان
تایێ توندکر..
من گازی کر.. من هەوارکر
ئەرێ دونیا بوّ یا تەنگە.. ؟ !
ئەڤ بهارە بوّ یا لەنگە... ؟ !

بهاریٚ گوٚت !
: ئەی ساتوریٚ دولٚو چیا
تە دیتینە جیهێت جوان
ئاڤا خوشا ڤان کانی‌یا
ئەریٚ هەنە ل منو باغی
جوانترو دل ڤەکەرتر .. ؟ !
من گوٚت : بەلیٚ... ! !
گوٚ تی : کیڤە.. ؟ !
من گوٚت : بهار... وەلاتیٚ من
من گوٚت : بهار.... وەلاتیٚ من.

( ٢ )

د سەیرانەکا خوشا کەڤن
ل ناڤ هوٚریٚ..... د دەریادا
د گەل پیٚلاو...
دەنگیٚ تەیرا
پەریشکیٚت ئاڤیٚ من د دیتن

یێ هەلدفرن.. !
چەند من حەزکر....
پەریشکەکا کوٚچر بگرم
لیٚ‌پا... نەکرا...
ل بلندییٚ... گرنژی‌و گوٚت:
: ـ ها هو.. هاهو....
چەوا ئەتوٚ دیٚ من گری .. ؟ !
: ـ تو ل کیڤەیی‌و دیٚ کیڤە چی ؟
:ـ ئەز ریٚڤینکم.... دیٚ هەلفرم
دیٚ کوٚم‌ڤەبم.... دیٚ بمە عەڤر
دیٚ بارمە سەر گوٚندیٚ تە.. ل بنیا چیای
دیٚ نیٚرگزا ل ویٚریٚ ئاڤدەم
ئەویٚت ل هیڤیا منو تەنە...
دا ب دیاری.... بدەین هەڤالا

ل رۆژا خوشی‌یێ
ل رۆژا دەهول‌و زورنا
ل رۆژا سەرکەتنێ.

( ٣ )

ل دەمێ ئەز زارو بووم
بابێ من دگوت:ـ
هەر کەسێ کلکا حاجیلەکێ
د ناڤ چاڤێت خۆ وەرینیت
چو جارا چاڤێت وی کول نابن... ! !
ئەز مەزنبووم

د نوژداریێدا... پێ‌گەهشتم
نە وەسابوو.... نە وەساشە
لێ‌پا ئەو حاجیلە من د دیتن
ل رۆژێت شەری
هەمی تەیرا هێلین هێلان
حاجیلە ب تنێ هوشیار مابوو
د گوتە هەڤالێت تڤەنگا: ـ
ها ئەڤەنە... ! !
ئەگەر دوژمن نێزیک ببا

( ٤ )

داربەروویەک هاتە خوارێ
بۆ سەرکانی‌یێ... لەشی خۆ ب شوت..
بەفرا چیا هەوارکرێ:ـ
ـ: ما بەس نی‌یە.... ب بارانێ تۆ خۆ د شوی ؟
ب نێرگزا
ب بهارێ خۆ خەملینی.. ! ؟

خوینا دلا پیٚ مەزن د بی... ! ؟
ـ :نەخیٚر... نەخیٚر... ! ! !
داربەریێ گوٚت:
د کانیێدا..

ل بەر پیسیێ... ئەز خوٚ ناشوم...!
ئەڤ کەهنییە... هەڤالا منە
د بن رەهیٚت مندا دەدرچیت
ئەو ریٚڤینگیٚ ڤان دەمانە...

دیٚ چیت... دیٚ چیت... بو سەفەریٚ
بو سەردانا... دارا پیروز
ئەویٚ دارا بەژن بلند
ئەو یا خوٚرما شرین د دەت
ل بەر ویٚ هندیٚ... ئەز هاتمە دەڤ...
دا سلاڤا...

دگەل پارچەکا ئەڤی دلی
ب دیاری دگەل ب هنیٚرم
ب دیاری دگەل ب هنیٚرم.

( ٥ )

ل ویٚ دەمیٚ ئەز زارو بووم
من وە دزانی:
کو گوٚندیٚ من... دایکا هەمی گوٚندایە.. !
ئەو باژەریٚ ل نیٚزیکی مە

هەر هەمی... هەمی ئەڤ دونیایە... !
ئەو چیاییٚ ل رەخ گوٚندیٚ مە
ل سەر ڤی عەدری... بلندترین چیایە... !
خیٚڤی بیستانیٚ مە
چاکترین فیٚقییٚ ڤان عەردایە...!

بابێ من ژی هیرقه‌لێ زه‌مانایه.... !
ده‌یکا من ژی.... ل هه‌می تشتی... ئه‌و زانایه... ! !
لێیا ئه‌ڤرو... ئه‌ز د بینم... !
جغزا بیرا من...
ل وی ده‌می... چه‌ندا ته‌نگه‌و بێ ئاڤایه... ! !
نه‌گوندێ من دایکا هه‌می گوندایه‌و
نه بابێ من هێرقه‌لێ زه‌مانایه
خاتر خاستنا من ئه‌ڤروکه...
گه‌لو ب زانه ل هه‌ر دووکایه
عه‌درێ مه ژی... عه‌ردێ مه‌زن
ده‌رچوو... نوکه‌رێ روژێیه
روژو نوکه‌رێت خو
د ده‌ریایه‌کا مه‌زندا... مه‌لهڤانیا دکه‌ن
نزا هه‌می پێکڤه.. ل جغزا کێنه
ئه‌رێ کێیه.... دلێ خه‌مدار... پر زانین که‌ت ...... !؟ !

( ٦ )

قه‌له‌مێ من حوبر تێ نه‌ما
هوزانه‌ك هات
ده‌مارێت من پڕ ئاگر بوون
کورکێت دلی...
ل ئاڤه‌کا تالێ....... ل من ته‌ژی بوون
ئه‌ز ڤه‌له‌رزیم
هه‌می چرکێت ڤی زه‌مانه‌ی...

**حسین ئه‌حمه‌د جاف**

د کوهێت مندا ته‌قین...!

شوڤ‌و زه‌ڤی د چاڤێت مندا ئه‌رزین.
سه‌ر زڤری...
گه‌لو... چبکه‌م...
کی دێ هاری ڤی دله‌ی که‌ت.... ؟ ! !

ب هێمنی.. وەك فریشتا
دەمارا خوینێ... نێزیك بووڤە ..!
قەلەمێ من.. ب خوینێ ئاڤدا...
ل وی دەمی:ـ
جوانترین هوزان من نڤیسی
ئەو هوزانا بو وڵاتی من نڤیسی.

( ٧ )

د ناڤ ئودا نڤستنا من
وێنەیەکی گوندێ مە...

ل سەر دیواری داڤزیایە

مالا مە... تێرا دیارە..
ئەو دار تویا ل بەر مالا مە
ئەوا یارێت زاروکیا مە..

ل پێش تێپەرین

منو هەڤالا توی ژێ خارین
نهو... ! !
هەر دەمێ تەماشا دکەم
دیوار د بژکیتو ...
د پشت وانرا
تارمایێ... دوو درەختا
وەك دوو یارا د تێك ئالاندی..

ئەز د بینم

داربەرییەکو دار خورمەکن
ل بەرامبەر هەمی باروڤا رادوەستن
ئەو باروڤێت ژیانێ د بەن
بەلێ چەوا...
ئەو هەردوو دار... د چقیاینە... د ڤێ ئاخێدا
چو باروڤە..... نەشێن ببەن
چو باروڤە... نەشێن ببەن.

O

# دوو دڵۆپە

## ١- خەونی شاعیر

پێشکەشە بە : ئەلف میمێکی تر

خەو دەبینم .. خەوی کەسکو سوورو سپی
لە گەڵ پیاوی هەموو جیهاندا دوژمن بی
بۆ ئەوەی تۆ هەر بۆ من بی

●●●

خەو دەبینم چی شاعیرە ئاگر بەر بێ
لە قەڵەمو پەڕەو شیعری
هەر بۆ ئەوەی کاتێ حەزت لە شیعر بێ
بێی گوێ لە شیعری من بگری

●●●

خەو دەبینم .. وشەکان دێن
دەبن بە کۆمەڵێ منداڵ
لە میناى پەنجەرەکەتدا
بە ڕەنگی خوێن
دروست دەکەن خۆرێکی ئاڵ
ئا ئەو خۆرە دڵی منە هەموو گەردوون بەتیشکێکی
عەشقی ئەو ڕۆشنە .....!

○

لەتیف هەڵمەت

## ٢- کۆچی سنەوبەر

کە باسی ماچی تۆ دەکەم
چی هەنگوینە دەبێ بە تەم
●●●

کە باسی پرچی تۆ دەکەم
هەتاو تیشکی خۆی لوول دەکاو
بەجێدەهێڵێ ژوورەکەم
●●●

کە باسی باڵاشت دەکەم
چی عەرعەرو سنەوبەرە
زیز دەبن و یەک لە دوای یەک
بەجێدەهێڵێ باخچەکەم

○

# کڵپەی زریان

محمد أمین پێنجوینی

شەرمەزارە ووشە
کاتێ لە زار دێتە دەرێ !
خولیایە بۆ هونەرمەندێ
کە زەینی پەیی پێبەرێ !

× × ×

شیعر ئەگری ، بەفر ئەگری
ئەستێرە ، پەلکەزێرینە
هەورو روبار و هەرد ئەگری
شەرم ئەکا مرۆڤ کاتێ
ئەنووسێ یا .... ئەڵێ ... ئەگری
ئەگەر زەردەخەنەم
هاتە سەر لێو بە ناچاری
درۆیە .
هەناوم قوڵپ ئەدا لە خوێن

لەناخما چی هەیە ئەگری
هەستو هۆشو ئارە زوم بوو بەقەقنەس !....
ئەوانیش دوژمنی «خۆ»!
یەك بە یەك ئەگری
نەء ....... نە ئەرز ئەدوێ
نە ئاسمان قاپی ی والایە
چ ... چ گۆڕەو شاری سووتانە !
هەتا پەروەردگار ، نەفسی سروشت ئەگری !
نیە پووشێ هەتا دەستی بۆ کەلا کەم
لەسەر ئەم زەویە بێ پەروا
لە گۆمی خوێنما خنکام
×××
هەچی کاوێژە وەك حوشتر
هەمووم هێناوە جوو !
دادی نەبوو .
هاوار
کە بڕوا زێڕو نەوتە ... داخ
بە تیشکێ کل ئەکا
وشكو تەڕ ئەگرێ
پەنام بردوەتە بەر ئێسقانی خۆم
ئەیخۆم
هەتا (خود) بێتە بوونو بەر .....!
کێ بۆ کێ ئەگری !
(وەلی) و (مەولەوی) و گۆران) لەناو گۆڕا
هەتا (تاهیر)و (ئەحمەدیش) ئەگری ...

○

# کۆچی چرا ئەزەلیەکان

سەعدوڵڵا پەرۆش
١٩٨٩

چراکانی ئەو شەوە گڵکۆنامێزە
زریان گەفی لێکردبوون !
« سیرا » یش نابیناو بێچەتر
بەڵام ئەڵێن گەریدەیی قەدەریەتی

- « ئەڕۆم هەرچەندە ئەشزانم کوختێ نیە
دەرگا بۆ تەرمی رەشەبا بکاتەوە
ئەوسا سەرێکم شك ئەبرد
ئەویش ئێستا خەنجەر سەمای تیائەکا
تا خوانەکا » -
خەو بردەیە

وائەزانێ لەوسلوە هەر بەڕێوەیە
کەچی سیحری خەوێکی قووڵ... لەو خەوانەی بۆنی گۆڕستانیان لێ دێ
وەگ ڕەگی پیرەدارێکی بەدەست وەیشومەوە ماندوو
یەك بەباڵای بەخاکەوەی نووساندبوو
هائەوەتا... پڕ بەگەرو.. لەژێر تەوری گیانەڵاوە
بەدەم وڕێنەوە ئەڵێ:-
- « نامرم کراسی ئەزەلم لەبەژنیدا
نامرم چرام لە ژوور سەری هەڵایساوە ».
ناحەق نیەو خەو ئەبینێ
ساتێ بە هەڵتەکانەوەی کۆنە کۆڕە دێرساڵەکەو
ساتێکی دی بە لە سەفەر گەڕانەوەی شاقەرەجە کۆچەرەکەی
لە خەونیدا:

ئەو رووت لەبەر ئاوێنەیێکی ڕۆح نوما
نوێژ ئەکا
بەفریش تاڵ تاڵ قژی خاوی سەر شانو گەردنو سینە شوشەیی‌یەکەی
رەنگ ڕێژ ئەکا..
خەونەو خەونیش گەرای دەیان زام دائەنێ
تا برینێ سارێژ ئەکا
نانبینایە
ئەڵێ سیناهی مۆمێکی تەم لێنیشتو بەدی ئەکەم
ئەویش لەدوور
دوور وەك خۆزگەی ئەو خەونانەی
شەو میوانی ئەندێشەنو
سپێدانیش ئەڕۆنەوە پشت سەرابێکی بێ سنوور
- « شەوانی ئەم دەرە خۆشە
حەز چاوی تیا ئەتروکێنێ
بەخیلی ئەبەم بەو دڵەی لە خەڵوەتی ئەم مەزارە پیرۆزەشا
نهێنی ڕۆح ئەدرکێنێ ».
وائەزانێ بە هاندانی ئەو شۆخییەی پاییز تینی هێناوە بۆی

داری بریا وەبەردێنیّ و ئەگاتەوە بەسامانی منالّیەتی جارانی خۆی
مۆمەو بێهودە ئەسووتیّ
بەڵکو بەم سووتانە تەمی تاریکی بڕەوێتەوە
وەك نەزانیّ تەنها هەر بەفری تەمەنە
ئەوەی لەژێر پیّی ئاگرا ئەتوێتەوە

* * *

گڕ زادەیە
ئاو سەری پیّ هەڵگرتووە

- « نا.. قەقنەسم لە بەهەشتی ئەفسانەوە
ڕێم بەم دۆزەخە کەوتووە ».
پەیتا پەیتا ترس تینی بۆ ئەهێنا
- « درۆنیە.. ئەم خاکە بیّ‌شومار ڕۆحی بە گیانەلاّ ناساندوە
بیّ شوماریش پەڕەندەی عیشقی سەرکێشی خستۆتە تۆڕ
تەنیا بەو ڕۆحە پیرۆزە نەوێراوە
کە ئاو زەفەری پیّ ناباو
ئاگر دەستی لیّ‌شۆردوە ».

خەو تا ئەهات قووڵتر بەخاکدا ڕۆی ئەبرد
توند تر گیانی ئەنوساندە ئەو پێدەشتەی
وەرزێك گوڵی پیّ ئەبەخشی و وەرزێك نەفرینی لیّ ئەکرد

- « نامرم مردنم بۆنیەو ئەتدۆزمەوە
پیربم بە چاوی تولاّزی بۆت ئەگەڕێم
تولاّزیش بم، لەو دیو قوللەی قافیشا بێت بە شوێتنا دێم ».

لەخەونیدا بوڵی بەری چرا بەدەست
دەسرازەیان بۆ لاندکی ساواییکی تازە لەدایكبوو ئەبەست

بەدەم سۆزی لای‌لایەوە :ـ بنوو تاتێر خەو ئەبینی
بنوو تەنیا بەباڵی سیمرخی خەون
دونیای خۆزگەت پێ تەی ئەکرێ‌و
دەستت ئەکا بە گەنجینەی هەموو کەون
بنوو نووستن ئەتبا بەرەو ئەو دونیایەی
سروشت ناوی ناوە مردن !
بنوو تەنیا بە نووستنی یەکجارەکی
لێمشتی برینەکانت دائەسەکنێ‌و
زامەکانت لەبەردەوام کولانەوە رزگار ئەبن

ـ « تلوانە کوێراییم دابێت
بوختانە من کوێراییم دانەهاتووە
لەهەر تەمەنێکا بیت‌و لەهەر کوێیش‌دا گوزەر بکەیت ئەتناسمەوە
ها ئەوەتای جارێ لە دار ئەرخەواندا‌و
جارێکی دی لە سۆلینی وەنەوشەدا خۆ ئەنوێنی
نا.. خەیاڵەو فریوی بینایم ئەدا
لێت ئەترسم ترسیش کەولی مەرگی لەخۆی وەرپێچاوە
ترس، هەڵی گۆرستانی لێ هەڵئەستێ
گۆرستانیش کلیلی دەرگای ئەزەلی شاردۆتەوەو
ملیونەها زیندەگیشی حەشارداوە » ـ

ترس.. گومان.. پیری.. مردن
بەدمەستانە قوم لە دوای قوم
دووا بادەی جوانلویان پێ ئەنۆشی

ـ « مردوم.. نەمردوم... نازانم
بەڵام بەر گوێم، بەر بینایم بریتیە لە یەك پارچە فەرامۆشی
نا.. خامۆشی »..!

○

# گیانەوەرێد دوێکێلی

## دیتن

گەلەك جارا
هەكو گرێ خەریبیا تە
بەر دبیتن ریلێ هزرا من
ئە زنجیرێد بەندا شەڤێ من رادگرن،
ئو نە دەریا شینا چاڤێد
کەڤنە، کەڤنە دەزگرا من
مینا دایکا گورکین بەر دید جەزرێ چەما
هەلدکولم گلکەنا خەما
کەلوتکێد سنورا دسوژم
دەکەهێد باژێرو گوندا!

دقوتم، دقوتم
هەمی کولانا شەدکەم
بیرهاتنێد خو دڤەروژم
ئەز خویکا خو
ژ رێوبارا
ل دەرێ مزگەفتا ستینم
دلەوندیێد قەرەچا وەردکەم
ذاسەحکەنە
خویچو خەتێد ناف دەستێ من
کا دموریێرا تەنابینم
ئەز هەستدکەم
کو دلێ من
ژ شیناخو یێ ڤەرەستی
لەشکەرەکێ رەشاتیێ
هێرەشا دئینیت هزرا من
دکەساتیامندا دبیت خاڤی،
دبیت سستی

ئەز هزر دکەم
ئاهـ ڤێ کاڤێ
ل درەکێ
کاکێژ تیرا نیچێرڤانا تو ئێخستی ؟
ل کیدرێ بویە راستی
بکێژ خاچێڤە هاتیەخاچدان
هەلاویستی

پاش تە دبینم یا نێزیک
مینا پشیکەکا کەهی
ژ ترسا سرێ،
ململانا بێدا دیێ

خو دایە ئێك
دچاڤێد من دا یا نڤستی

⊙

خڕ ئێڤاریا
روژ گدیەکا چاڤلدەرە
من دسێلمینیت
پشتی روژەك دویرو درێژا گەڤزکێ
سەرێ خو ژسینگێ من ڤەدکەت
خو ژناف دەستێد من دهەلینیت
هەرو دبینم
ئەوی دێمێ سوراف کری
کراسە تەنك لبەرەخو دنیسنیت
نە ئەز دزانم
ل کیژ کەرخێ دبیت پەیادە
نەل کویراتیا بەحرە شەڤا
لسەر بالگەهێ کێ دبیت مێهڤان
ل سەر سینکێ لیس دمینیت

* * *

هەمی شەڤا ئەز جارەکێ ددەم دلێ خو
روژا پاشتر
دەستو پیا لێ گرێدەم
سەر برها لێ بتراشم
تەنیێ تێدەم
بەرو پشت لکەرەکی سیارکم
ل کولانێد باژێری بگێرمو هەوارکەم
وەرنە روژێ.. چاقلدەرە
هەمی شەڤا دپاخلێد بیانیا دا دڤیت

قەبحەت کەرە

لێ بمن نینە
دگەل سپێدێ
ئەوی دیمێ زەرو وەستیای
ئەز دئالیسم
دبێژمێ: روژێ
تویا جوانی
شەڤێد تاری لدەر نەمینە
خەلکێد وارێ من عاشقن
ئەنێد وان بسجدا ڤە رزین
ل هیڤێید دزگرێید خو
دەزگرێد وان
سەرکەتنو روناهیێنە
عاقل روژێ
گوتکوتەکا مشە یاهەی
نژدە ییێد کەتین کەلیا
دەلنگێد نازدارا دگرن
دبەنە شکەفتا... دبەنە چیا
تو نابینی
ل کولانێد مە    ل سەر بانێد مە
سەر مژویلانکێد چاڤێدمە

خر چەپەرن
حەتا پەیڤێد مە شەرکەرن
چاڤێد دایکێد مە تابینە

٥

تشت

هەمی ئاهێد سەر ڤێ ئاخێ
دبن دبچویك، دساڤا، دساڤا
دگەل بزاڤا روناهیی‌یێ
مەزن دبن
لەشەرگەها وەرارا خو
ل ژێر تاجێ بلندیێ‌ین
دبن خو دکارێد جانێ خو
دبن زاڤا
جارەکادی
بەرەی ژوردانی ددەنە رێ
بەرەف رویپا نەچاری‌یێ..
بەرەف مرنێ
هێدی رادکێشن پێنگاڤا
لێ ڤیانا منو ڤێ ئاخێ
هەر ژ سەری یابو ی مەزن
ئو هەرو هەر یا بور دبیتن
تیتا دندك هنارێ یە
چەند ببرن
چەند بسوژن
یتر درێژو شور دبیتن
هەمی کاڤا
دگەل پیلێد سەرخوشیا ئەڤێ عشقێ
یێ ئالوزم
د ترسم سو بەهـ
ڤیانا هە

ئه ردو ئەسمانا بگریتن
باشی جهێ تە کەچکێ...

تە سەرباری

دفرهەیا سینکێمن‌دا نەمینیتن

O

## یاخیبون

د بێژن ئەڤ ژیارە دەریایە
هەر کاڤەکێ
پێلا
ب رەنگەکی هاردکەت
ئەڤروکە هو
سوبەهـ‌کی دزانیت چ بایە ؟
بژی بو گاڤا تو تێدا
خوشییێ نەدە ب روژا نەخوشی
ماکێ دنیامە بەزاندە... بو کێ مایە ؟
سەرێ لبەر خوشی‌یێ و سرێ
نەدە بەر حنکا هەتاڤێ کەرمو گورێ
دەستێ خو ژ خرِ ئاها بشو
مایتێکرن ماکا ئێشان‌و قەدایە
وەلێ کەلو من باوەرە
هەچی کەسێ
تیروژکا عشقا ژیارێ
هەستو هزرێد وی نە رهڤێت..
پێڤە نە دەت

دلێ وی نەبیتن قوناغ
کاروانێ ڤیانا ئاخێ
حەزکرن‌و شیانێد مروڤا
ل وێ قوناغێ بێن ڤەنەدەت
ل پەی بەژنا روژەکا نوی

سوبەهـ بێتن
خوهـو خوبنێ تێکهەل نەکەت
هزرا بچویکا ئاڤنەدەت
کەر ماڤێ وی تێت کە رافتن
نە ئەرنیت
چ یاخیبون لبا روی نەدەت
ل دەرێ کوینا پیرەکەو..... عەبایە

O

## دویکیل

هەیهو زەمان
تە سەرو بن چ تێکوەربون و
چ ئاهەك وەك خو نەمان
دویکێل... دویکێل
یابەربویە سەرو چاڤێد بازێریمن
لێدکەتە هێل

مەمکێد ژیارێ هەڤشین
سەرێد بازێری مان ستەور
دویکێلەیا بویە ئاغاو
بەختێ گەور

تو دبێی کەسەك خو بکەتە با
سینکێ دویکێلێ بژەنیت
خو بکەتە داس
خوبکەت بڤر
رهێت دویکێلێ برەنیت
توکەس نینە !!
ئەز ترانم ئەڤی خەلکی
گیانێ وان ژ دویکێلێیە
یان دایکێد وان
ژ بچویکاتی
ب سەرو چاڤاڤە( ...... )

« کەریم دەشتی »

١٩٨٤

# بیابان

خەم بەسەر خاکو خۆڵەوە
تەم بەسەر وەردی مس‌ئاسای نێو بیابانی چۆڵەوە
تەنها تاقە مەلێکی دوور بەسەر خوێنمەوە دەخوێنێ
میوانداره ئەزیزەکەم کەوانەی راوی خەمی خۆت
لە دەنوکت بترازێنەو بەدیاری بۆ من جێ‌بێلە
ئەوا گەرمای دۆزەخ کە لێبەی لە گۆشتی من گیرکردوە
نێڵەی ئاگر برینی من دەلستەوە
زۆر لەمێژە خورەی چیا لەنێو دڵی من‌مردوە
مەلی گیانم باشوکەێیکە لەکەرنەك هەڵدەکروزێ
تەموتوانی هەورە تریشقە هەوالێ تازەنەمانی‌میری زمانم بۆدێنێ
هەنە وەك من دواقەفتەی شەمشێری گیانیان گرتۆتە دەست
دڵیان هەنجن هەنجن دەبێ
هەنە وەك من لە خاچی بالۆرە دراون
جگەر لە تاو کون کون دەبێ
بە سەر لمی ئەم بیابانە دەتلێمەوە
نە سێبەرێ بەدی دەکەی نە پەنایێ دیارە بۆسێبەر

وەرسی ئەم بیابانە هۆنراوەییکی مەزنە لە لم چەو هەلکیشراوە
لە پسدانی ئاگراوی تۆزو بادا لەدایکەبێ
لە کەرای ژێر گەرمای ناو زیخ و چەوەوە رومەتی پانی ئالدەبێ
لەگەل ئازارو شکانەوەی دەرونم بەرد دەجمێ وچیادەهەژێ
با بۆ دارستانو جەنگەڵی دەلێتەوە
سەراب بۆ زەوی ئاگری دەگێرێتەوە
من دەبمە سوارێکی نێو تۆزی غوربەتو ژانی ئەستور
ئۆدیسۆس ئاسا دەگە ڕێمەوە ئەوشارەی هیچ کەسێ نامناسێتەوە
ئەوە نەبێ مەزنترم لەوسوارانەی کلیلی خوادایان پێیەو
داستانی دۆزەخ بۆ خەلك دەکەنە پەینی چیایی
لە ئاستانەی مێژودا بەسەر بەرزترین پەیژە دەوەستم
وەکو شەختە گریانی قولو بێدەنگی هەلدەبەستم
دەبوایە من لەو بیابانە ئاوارەبم.
ئەی لمی پانتایی مێژو، ئەی سەروەری فرمێسکی چاو
چی دۆزەخ و خەفەت هەیە بۆ من پەنجەرە ییکە لە ئاو
چاوی مرواری ئەو ماسیەی تیادەبینم
کە جوانترە لە تەمەنی هەزار سالەو لەبەژنی درێژی خۆشی
لەو دەستەی لە ژێر تەنوری بوردەگی دا بال دەکەوێ
لەو هەتاوەی لە پاش بارانێکی تورە
وەکو کۆرپەییکی ساوا لە دایکەبێ و دەر دەکەوێ
بیابانە هەمیشە بیابان،
بۆمن خاشبونی ئێسقانە، پەنجەرەییکە دەروانێتە دۆزەخەوە
ڕێگایەکی داخراوە، ئەلقەییکی مەرگاوێژە
وەکو ئەکتەرێکی گەرم دەوری بێدەوری دەگێرم
وەکو ئەو سەرەمەزنانەی بەسەر کتێبەوە بەندن
وەکو ئەو سوارە مەستانەی
ساتێ مردون.. ساتێ خەیامێکی رەندن.
هەموو شتێ لەم لمەدا روو دەچێتو دەتوێتەوە
تەنها لولاقی تەقەلای دلم نەبێ
لەژێر چەوەوە لێدەداو دادەخورپێ
گەورەترین بروسکەو هەورە تریشقەی ئەم دونیایە
دەبێتە کۆتری ترسو لەسەر شانم هەلدەکورمێ

کەنارەکان تەی‌دەکەم هەموی هەرکەناری زیخەو بەردی داغە
کەبیابان لەباتی پشی‌گەرم هەڵیاندەمژێ
دراکۆڵایە بەبێ وەستان‌و دوو دڵی نزم‌ترین شەپۆلی ئەمڵە
بەرزترین ترۆپکی خوێنم دەمژێ،
ئەمڵسورانەوەی ژیانە یابەمردن لەخاچ‌دانە

کەناچەیێ دیارنیە بەسەر سەرمەوە بسوڕێ‌و
ئایەتی شیعرەکانی من لەبەر بکاو بگەڕێتەوە لێواران
هەزارێکیش دیار نیە قەلای ماندوو بوونم بباو
بیکا بە مەقسە لەی برسیەتی ئێواران..
ئەمانە هەمووی ئاگری رقی‌منە، شکایەتی خوێنمە
شکایەتی دڵنیایی‌و ئومێدمە.
من ئەی سەرابی سەرانسەری ئەم زەمینە
دڵنیام لە هاتنی خۆم... دڵنیام ناپەڕێتەوە
دڵنیام لەوەی کەتازە لولاقی من بۆ لەشم ناگەڕێتەوە
روخساری ئاویم هەنسکی ئومێد دەبە خشێتە فەزای یەکجار بەرینتەوە
دەنگی هەنا سەم مژدەیە بۆ ئەو بێدەنگیەی لەدەرونی خۆتت شاردۆتەوە
جولانەوەم دەستێکە بۆ تەکان دانت
خەونێکە بۆ ئەوخەوەی کە هەزارساڵە هەڵدەکشێ‌و نارەوێتەوە
تۆش ئەی گیانە سەرکێش‌و تەمەچڕەکەی سەرشانم
گەردونمان پێکەوە بەندەو بەلام وویستمان زیندوە

سیمرغی ـ خۆری تەورێزە ـ
بەسەر شان‌وملی مەولانای دڵمانا هەلاتوە
خۆم نادەمە دەست تاعونی بێدەنگی وپەتای دوو دڵی
خوێنم هەر دەبێ بە مەلێ چاو سوور بکا لە گریانا
باسی تەختی مێرایە تی گیانم بکا بەسەر خۆڵی بیابانا.
هاکا هەمووشتێ سەنگی خۆی لەدەست بداو ئاگر بەربێتە رەنگەکان
بەفر ورد ورد پروشە بداو من ببمە چەقی سەنگەکان
نێرگیلەی گیان ببلقێنم، بیکەم بە مۆرفینی دڵە ئازارەکەم
قەلنەی خوێنی خۆم بکێشم، خەونی نێو سەری هیلاکم داگیرسێنم
پێکی‌چاوم بخۆمەوە
ئەوسادەچمە دواسنوری مەلەکوتی ئەوفەزایە

چ شتێ لە سەرکێشی ئەوسەردەمەم بەرزترە
چ شتێ لە بینایی ئێستای تەمەنم سافترە
ئەسپی سپی ئەو ئەشقەی من.. بڕوانە
چۆتە سەرکام کەپکە شاخی بەرزی مێژوو
وەکو ئەو ئاسکە کەسکەی لە نێو رەوزێکی سەوزا
هەڵیدەنە ناو سەحرایێ
گۆرانی بۆ بێچوەکانی خێ بچرێت و
شێت بێ لە حەسرەت چیایێ
شمشێری دەستم دەبینی چۆتە ملی کام نەهەنگی دەمامک دراو
هەڵۆی دڵت نەبینیوە لە کام دوندی مەزنی خۆی مەڵاس داوە
بیابانە.. هەمیشە بیابان
لەمن نێچیر لە ویش راوە !.
هەموو شتێ چاوەڕوانی مەلە دەکا لە دەواری رایەکانم
من دوو باڵم
نیوەی دڵم بنیات و ئەشق و ئەوین و سەرخۆشیە
نیوەکەی ترم رمان و ئازاوەو خەفەت نۆشیە
لە ناو شەوی بیابانا لە گەڵ ئەم گەردونەتاڵە
هەموو شتێ لە بوونی من نارازیە
بالیەی شێتانەیەو تروسکەی شەمشێر بازیە

من دوو باڵم
باڵێکم لەشی ناسکی بەرمانکە شەوی کچێکە شەهوەت دڵی لێسەندوە
باڵێکیشم کافوری بیابانێکی شەهوەت کوژە
نە خشەی فڕینی یەکجاری لەریشی خۆی هەڵکەندوە
ئەی بازرقەی دەرونی من تۆ دامرکانت بۆنیە.
کێ دەزانێ من لەکام تروسکەی ئازارا لە ناودەچم
لە کوێی مەرزی بەرگە گرتن لەدایکەبم ؟
چۆن لە پۆپەی چیای شێتیم وەخوار کەوتم ؟
ئەوکاتانەی هەموو پۆلیەی گەشی برین دادەمرکێن
دەبنە خۆڵە مێشی بەرپێت
لمی بیابان دەتوێتەوە و گیابەند دەروێ
منیش دەکەومە نێو چەقی ملیونەها ئارەزوی شێت

خەنجەری لولاقم لە کالانی ئەم بیابانە دەردەکێشم
بەناو پانتایی رادەکشێم پەنجەرەی بوون دەخەمەسەر گازەرەی پشت
سەیری خەونەکانم دەکەم دڵم دەگری و دەتوێتەوە
وەکو سمۆرە زیتەکان بەبەرچاوم رادەبورن، تۆزێ خۆم لەبیردەکەم
لەم دونیایە کە تاوانی وەکو بەلەمێکی پیرۆز بەبەرچاوان دە خولێتەوە
ئەوسا کێ دەزانی کەمن لەنێو بیابانا تەنهام و
لە تەنها یی دەبمە شای غەریب و نادیارەکان
شەمشێر ەکەم وەرسی یە لە بەرجەستەی خۆمی دەدەم
تەختەکەم برینی لەشەو، تاجەکەم سەرکێشی گیانە دەبریقێتەوە
تاوانکاریش ئەو مەسیحە روح پاکەیە لە تابوت دەریدەهێنم

لە خاچ و میخکوبی شەوانی پڕ نوری خۆمی دەدەم
ئەی خوای ئەم بیابانە چۆڵە کە چۆڵترە لە گۆڕستان
کە چۆلترە لەساتی دوای دەست لێکبەردان
گەرمترە لەمەودای نێوان دوسینەی ئەوینداران
سارد ترە لە ژەهری قسە کە دەرژێتە ناو درەختی بەهرەداران
لە مارشی پرسەو تەرم دەچێ
دەبا هەرچی مەرگەو چەموروبارهەیە لە تێنویە تیت کەمبکەن
لم بەندی بەر پێی تەمەنی چۆلم بسمن
ئێستاکە سەرم تۆپێکە لە مەیدانی مەرگ وسەرکێشی دەخولێتەوە
برومیتۆس منم، بەلام ئاگرم نەدزیوە

بیابانیش ئەو درەندەیە کەدانی تیژو گەردەلول
لەهەست و سینەم گیر دەکاو خوێنم دەخواو دەخواتەوە
گەرما وەك کرۆسکی دەریایێ دەیشواتەوە
من قەرەجی چۆلنشینی ئەم هەوارەم جوانترین گۆرانی و بالۆرەی خۆم دەبێژم
جوانترین شیعری خۆم لە گۆڕی خەفەتی مێژو دەنێژم
باسی مردنی خۆم دەکەم بۆ زیندوویم.
هەموو شتێ لەم بیابانە گۆلە سەگە
لە قلوغی نێو کپیدا لە خاچ دراوە
من و بەردو خاك وخۆڵ و کرمی ناو خۆڵ
یەك یاسا هەڵماندەپێچێ

دیلێن بە دەستی مەداری یەک گردیلەویەک مۆلکێول
منو شیعرو مەزنیو شاو هەژارو دۆم
منوخۆم، هەربەتەنها یەک یاسا دەمانخاتە دەمی خنکان
دەمانخاتە ناو مەلەوانی قوڕوچۆم
دەبقیژێنە ئەی ویژدانی مەلاوی ئارەزوی پاکان
ئەم بیابانە لە زمانی هیچمان ناگا

ئەم بیابانە شەوی دریژی ژیانە !
لە پانتایی ئەم بیابانە ترسبارەدا وەستاوم
وەکو ئەوەی کە بیەوێ بەرلە بابگرێ، گوێ بۆ گۆرانی خنکان رادێرێ
یا بە لەمێک رەنگ بکا کە نغرۆ دەبێ
قسە لەدەم سەرەمەرگی هەژارێکا بقۆزتەوە
یا لەهەوادا باز بداو لە چەقی ئاسمان بوەستێ

لە ناو هاودەمێ باڵ بگرێ
وەکو ئەوەی عاشقی رۆژبێ شەوبمرێ
ئاوەهامن لە ناولمدا پیر بوویمو تەمەنمبەسەر دەچێ.
لەپانتایی ئەم بیابانە ترسبارەدا وەستاوم
لێوەکانم گیای تینویە تیان لێرواوە
چاوم ئاوەدانی مەرگباری لێ نیشتوە
پێیە کانم موی شەکەتیان لێهاتوە، چۆڵیهەستم دەسڕێتەوە
ئاوەهامن دەگەڕێمەوە پسدانی ئەم سروشتە مالیخۆلیایە
ئەو سروشتەی منی زۆر بە سەختی هێناو
بەڵام زۆر سوک هەرزانم دەکرێتەوە.
دەگەڕێمەوە یەکەم زیرەی لە دایکبوون.
وەکو ئەو ساقەیەم لێدێ کە تازە پەڕوپۆدەبێ
بەرتیری تەمەن دەکەوێ بۆخەرەندی بێسەروشون.
ئەی سەرابی بیابانی مەرگ ئەی چەوی داغ
ئاسوێ ئەم ئێوارە بگرەو مەهێڵە چیتر ئاوابێ
باهەر لەشت خوێناوی بێ

که زی ئەم خۆرەتاوە راکێشەو با بێتەوە
مەلەکان بانگ کەوە بادووبارە گۆرانی تەنهایی بچرن
من بێزارم لە ئاوابوون.. بێزارم لەرۆژ بەسەرچوون
بێزارم لە هەزارجار مردن هەر بۆساتێ لەدایك بوون
گۆرانی لە خوێنی مندا هەڵبهێنجە
ئەم کەونە سەرەوژوور کاتەوە بۆ ترۆپك
شەفەقێ لەسەرم گیرکە تاریکایی ئەم زەمینە کورکاتەوە
دێوەزمەی ـ راسکولینکوف ـ ی ناو دڵم بێتە سەر چۆك
لەشم بۆتە دوو کەرتەوە
کەرتێکی کێلگەی وەرداوی نێولمی هاری بیابانە
کەرتەکەی تریش هەستو نەستە، خۆرو خەونە
سندوقی ..رگ و خەفەتی کەونە
من ئێستا نیوەم بیابانە
نیوەکەی‌ترم بە گۆرانی وگوڵی لۆتس ئاوەدانە
من باڵندەی ئەفسانەییم راستیم لە نێو باڵم ناوە
من نەبوونم هەبوونم لە دڵم ناوە
ئەی (وانی) نێو لمی بیابان
وەرە باسی گیابەندو رەزی سەوزوسورم بۆ بکە
باسی جەنگەلم بۆ بکە... گەلای ئارامم رزیوە

من بێزارم لەوسیمایە کەوەك مردوی هەڵوەریوە
ئەی بیابانی ئاوەدان بە سەرابی شین
تۆ لەوەرسی چنراوی
یا لەداوی درێژی مەرگ ؟
کێ دەتوانێ لە خوارکەوتنا بکابە ناو سێرەی ئاسمان
لەسەرکەوتنیشا بکا بە ناخی زەوی ؟
کێ دەتوانێ وەك من نەرم بێ بەرد ئاسا
رەقبێ وەك رومەتی مناڵ و دڵ ئاسا
حەزم لێیە بەر لەمردن پەی بە ماهیەتی خۆم ببەم
وێرای مەلە جوانەکانی ـ عەتار ـ کەوم
پرسیار بۆ خاتو هودهودی خۆم ببەرم.
ئای چەند سەختە، چەندگرانە ژاڵەیە زەهری هەلایە
بۆنی شەر و پرسەی مەرگ شیعری لێدێ.
ئەسپی خۆم تاو دەدەم تاو دەدەم
چەند بچمە نێو ناخی ئەم زەویە خێواوە
ئەوەندە مەست دەبم
تاتووشیشاژنی هەست دەبم
من دەبێ بکەمە دەریایێ
ئاوازی خەمی خۆم بکەمە بارانی سەحرایێ
مۆری ئەو برینەم دەدەم لە قژی تۆ
دەیدەم لە بەردی گەرم، خاك وخۆڵ
سەرابی ناو دونیای چۆڵو هۆڵ
لەشیمن دوولەتە، لەتێکیان هەرشەوەو ماتەمیوسێبەرە
مانگ گیران، رۆژگیران بۆ کاروان رێبەرە
لەتێکیان هەر رۆژەو ئاهەنگو هۆنراوە
بارانو گوڵە  گە نمو کوێستانو هەتاوە

○

---

* لە کۆڕێکی شیعریدا کە لە سلێمانی سازادرا ئەم شیعرە خوێندراوەتەوە

# باو باڵەکان

دڵشاد عبدالله

با سیحر نی‌یە، ئێوارەی
سێوی نەگەییوە،، نەدرەوشاوە
ئەوەی دەیبا کەڵا کەڵا بەمردوویی
دێنەوە بەر ئەو ماڵانەی هێشتا بەیان لەدەرگای نەداون
دێنەوە کەنارو گەشتمان دوادەخەن
پێم‌وایە، ژن‌و پیاون
شەو و رۆژ
ژیان‌و مردنیان تێکەڵی یەک‌بووە
لەولاشەوە، تەپڵەکان نووساون
رم ماندوو

وەرزەکان پێکەوە دەژەنرێن
ئایا من خواوەندم ؟
گەمێ لە ئاوێو بەو قەوزە دڵتەنگەوە
لەبن ئاسمانێ دەبریسکێنەوە
زێڕۆی شەمسی باڵەزراو، ڕۆخانەی جێماو
سەرخۆشو بەرزو فراوان
لەو دیوی ئاوەکانەوە هۆز ماندووە
قوربانی لە بەردەکاندا گوڵاڵەی شەرمۆکن
ڕەنگەکان دەڕژێنە ناو یەکدی
ئەوەی هەیە داپۆشراوە، شینو داماو
تەون خامۆشی کردوون، زەنگیان دەنگی نەما
لەش بەتەواوی گرفت ـ
دەستکورتەو ئەو عەیبەم پێداناپۆشرێ
کەڵەشێر دەبینن

ڕۆژ گوڵە گوناحێکی زەردە
خاڵ لەسەر ڕوومەتان گزنگیان دەمگاتێ
ڕەنگن لە گەرمیان دەمرن

ئاو دەڕوا، هەر ماسیەو ئەستێرەی خەمێکە ڕژاوە
منالٚ هەر لەبەر ئەو ترسە
دەڵێی سێون لە سەبەتان
دەڵێی خۆشین
بەفرە، ڕێکەوتە بایە، مۆسیقا لەگەڵم
بلندەو نابینا، شەپقەی لارە لەجوانیان
لێو تەنك، بەکوێری دەبینێ
هەناری ژنان دەنکن، لەگەردەنان دەڵێی خۆرن ئاوادەبن
ئاو هەڵدەستێ، لێواو لێوین
جواني لەخوای دەبێتەوەو بەخۆڕایی بەژنەکان وەدەنووسێ
ئەو لەشە ئاوێکە نەمدیوە ـ ماسیەکان وایان ووت ـ ئەو ڕەنگە کەمێکەو بێئاواز ڕژاوە

ماسی نیم
ئەو ئاوە ئاوایییەکە سەرسام
گەرایە، ترس گرتوو
نەوا خۆش ناووتریّ
چوار فریشتە بەو بایە دێن، بەو ئاوە
نان لەپێشم دادەنرێ ! بیخۆم
ئەویش تەواو دەبێ، نەیخۆم
جوانی جارانی نامینێ
لە سیحرو نوکتەی با ترساوم
گوڵەکان لەبنی بالوعان، لەناو حەوزەکاندا خنکاو
نە بەرزم نە نزم
ئایا من خواوەندم ؟
زێرۆی شەمسی ئەو چەند ساتە کورتەی ماوە
پیاڵەی ژە هرەو بەترسەوەو بەتاسەوە دەرژێ
باڵەکان ئاسمانیان بلندە
باڵەکان تواوەن
خڕیان کەمەوە فرمێسکن
برژێن، پەیکەری گریاون‌و چی‌تر نا
خەونەو بێ‌ئارامە: ددانم: دارێکە کلۆرە
گوێزی پووچن غلۆرەبنەوە
سمۆرەش پیتێکە نیگەران

بکەوێ دوانە
هەڵقۆزتەوە میمێکی سامناکەو بەمردن وەدەنووسێ
کوێر نیم، زەردو خەییون میوەکان
میوانم نزیکە
هەناسەمان کەڤ لێ‌نیشتووە ئاڵوزی یەکترین
مۆمیام‌و ماخولیا
ئەو ئاوانەی دەگەنە رۆژئاوا
کەشتیان بەشەوێ گرانەو کەس نادوێ

پیاوان دردۆنگ‌و سەرگەردان، سەرگەرداو کەوتوو
بەپەلەو بە هەڵەداوان، ئەو ڕێگانە هەڵدەبژێرن کە ڕێ نی‌یە
زراڤ‌و بێ پەیمان
لە پەنجەرانڕا شەڵدەکشێن، کێژو بێ‌ئاگام
ژنان‌دێن، تەونیان توندە
شمشاڵن لە دۆزەخێوە دەژەنرێن
خۆڵەپۆکیان نزایە، کوک‌و ئامادە
گونجان‌و نەگونجانیان نی‌یە، ئەنجام‌و بێ‌ئەنجام
فرمێسکیان بە دەنووک‌و بەکەسکی ژیانی واهەڵگرتووە
با نەیخا
هەواش ماندووبووە
پەنجە ناچنەوە پاڵ یەکدی، پەرش‌و بڵاو

ئەوەی هەبوو ڕژاو ئەو مامزە دەڵێی پایزە وەڕیوە
لەو ئاڵۆزییەو بەو وەختە ڕەنگە بزرە
گەشتەکەم بزرە
من نیم ـ بەو باڵە دزراوانەوە ـ لاڵم
کاتەکان هەروا بەخۆڕایی نارۆن
سووکن. بەو حاڵەش هەر ڕانابوورن
دوای ئەو مشت‌ومڕو گرفتەو لەگەڵ ئەوەی مردن
پۆپینەیەکی سووری گەورەیە
کەچی کات هەر ماوە.
ئەو دەنگانە دەنگ‌نین
باغن بەو پایزە مەستن، کۆترە شینکەن
لەو دیوارانەوە دەڵێی ترسن دەفڕن
ئەو دیوارانە بەیانن
لەسەرخۆو لە بنەوەڕا دەڕوخێن، شەرمەزارن.
پاشماوەی داوەتەو برۆ لەیەکتری گیرن،
ماڵ چۆلکراو، لە نزیکیان‌دا نابینرێن
شەو بەجوانی لەڕەگەوە دەنگی دەهات

چاو گەرمو داخراو، ڕۆژن نەهەڵدێن نەئاوادەبن
عارەبانەی مەستو خومار، لەبن ئاسمانێ دێنو دەچن
قەشە نووستوون
منالان گازیان لەو سێوە پایزی‌یە دەگرن
ئەو سێوەش لەبن دوان دەڵێ سیحرە
نەدەخورێو نەدەچێتەوە ناو سروشت
لەو دیوی ئاوەکانەوە
زێڕۆی شەمسی هەڵۆیەو بە هەوەس با دەیهۆنێتەوە
ئایا من خواوەندم ؟
لێوارەکان لێرە زەڕنەقوتەن کاسیان کردووم
لەولاشەوە گورگن برسیو ئەو ئاوەیان بەسام ڕاگرتووە
مۆسیقا لەو ڕۆژە تەڕەی پایزێ دەنیشێ
دەکرێ ئەو ساتەی لە دەرەوەی ساتەکان دەدرەوشێتەوە
ساتێ کەباڵ دەجولێنەوە، ئاوگ سەردەکەون
ڕۆژ لە هەناوانو بێ‌پایان دەڕژێ

ساتێکی تێکڕاو بەردەوامی وا: بەو پێ‌یە زیوینەو نزیکی‌با ببینم.
ببیسم •
ئەو گۆرانی‌یەی لە منالیەوە بزرەو نائومێد
شەپۆلیان لەو بلندیەوە بوەستێ
من لەوێ نیم، نیم
ماڵەکان ناڕێکن، هەڵۆ بفرە
ئەو ئاوازە وەختە باڵی لەئاوێ بدا
گەشتوەر زۆرن
ئەوەی هەیانە دەیدەنە گەلا
گەلاش ڕەگ ڕەگ ونیان دەکا
بۆنیان با دەیبا، جەڕەیان بەتاڵ، موویان وەریو
هاتوهاواری دەریاوان، ناگەهانی ئاوەو زاڵە
ژن پێکەوە
پیاو پێکەوە

ئەوانەی مردوون، لەسەر پشتی با
بەو ترس‌و ناهەمواریەش ئامادەن
ڕێکەوم لەگەڵ با، ناڕێکم
مل‌بنێم، هەڵۆ نافڕێ
باڵەکان کە لێم‌دەبنەوە بەلەسەن
کافووری منالێن لەسەرمان جێ‌ماون
گوڵن لەو سەرەوە سەرەوەرو نائومێد
هەڵدەوەرنە ناو ئاسمانێ
بۆنیان دەمار دەمار سەرگوزشتەن مردنم دەبەن
گەشتەکەم دوادەخەن
هەرچەندی بووتریم مانام ئاڵۆزەو بزرم
هەلۆ نیم
زێڕۆی شەمسی بەو ڕۆژە نابینرێ
نە ناشیرینم نەدەکرێ جوان بم
چوار فریشتە پردەکانم دەگوازنەوە
نوێژیان کەرمە
دەبینم
دەنگەکان دەبیسم ـ کە دەنگ نی‌یە ـ
وورتەوورتێکی بێ‌ماناو بەرزترم‌و باڵ‌دزراو
تاریک‌و روونم تێکەڵاو
ئەنجام‌و بێ‌ئەنجام
کەچی ئەوە بەتۆ دەڵێیم: ئایا بەو حاڵە خواوەندم ؟

١٩٨٧

# کۆژانەوەی سەرچاوەکان

■ نەژاد عزیز سورمێ ■

■ ( ..... ؟ )

بە کرەبای کۆچ هاتن
داگیرسابوون شەوقیان دەدا...
بە بای ناخیان
هەڵدەبوون و دەکوژانەوە
بەناو دڵەڕاوکێی سەردەمی
هەورە ئاو تێنەزاوەکان شۆڕبوونەوە،
شیعریان بە پێش کەوتبوو
هاتن کورتان بۆ کێچ بکەن؛
کاغەزی سپی بخوێننەوە...
تا گەیشتنەوە سەر ساغە !
نە پیاو، نە ژن
ڕووی خۆیان نەبینیەوە.
وەختێ گۆڕیان هەڵدانەوە،
چەند [illegible] خەنجەری ژەنگاویان لێ بەدەرکەوت،
[illegible] لوان !

## ■ مۆدلیانی

ڕووبارەکانی دۆزەخ
لە ژووری گریانەوە دێن
شوێنەواری هیچ ڕێگایێ دیار نی‌یە؛
داڕستان‌و بڵندایی پیلیان تێک هەڵکێشاوە
تۆ هەر بڵێ‌و بڵێرەوە
کەس بەنرخی باوەڕێنیش ئاوڕی لێ ناداتەوە ! !
کێ ماسی لەناو ئاو دەکڕێ ؟
تۆ هەر بڵێ‌و بڵێرەوە؛
( لیفۆڕنۆ ) نوقمی کوێرایی دەریا بووە
دانی لە دەمامکەکانت گرساندووە.

* * *

« ئای ئیتاڵیای خۆشەویست »
کەسێ نی‌یە لە ڕەشەشەوی پاریس‌دا
چرایەکی بۆ هەڵبکا
( جین )یش جۆگەی ڕووباری دۆزەخەکەیە
لە ژووری گریانی دانتی دەکاتەوە؛
هاوارێکی بێ‌هودەیە
تەمەننای مەرگی دووەمە..
« ئای ئیتاڵیای خۆشەویست ! »
مەرگە کەنارەکانیشی ڕەش کردەوە....
باسکی مێژوویان باداوە
کەس نی‌یە سەرەداوەکان گرێ‌داتەوە
« ئیتاڵیای خۆشەویستم »

شوباتی / ١٩٨٩

ئەحمەد رەسووڵ پشدەری

پێشکەشە بە

برای شاعیر دکتۆر نافع ئاکرەیی

١٩٨٩

لە لێرەواری ونبوون ....
سەرخۆشی ئەزەلیمو ..
بێئاگا دەژیم ..!!
نە شاگردانی جالینۆس لە ئاڵۆزی مەژیم دەگەن !!
نە گۆشەگیری مەیخانە بە شاباڵی ویلیم دەگەن !!

* * *

جیهانی ئاسوودەیی لە بیابانی تاسەمایە
بەهەشتی بەختەوەری . لەبن نسیّی کاسەمایە
کەی پەپوولەی تەڕی بزە .!
لە داستانی کەیلیم دەگەن ..!!؟

* * *

بەپێخوستی سەرەڕۆیی .. ونبووی ناخم
زۆر و زەوەن ..!!
کوا شێتی شلۆق ئاسا ....
پەی بە خەمی وەك من دەبەن ...!!؟

کەی دەنکۆڵەی گەردانەی ڕاز .
لە نهێنی ... زویریم دەگەن .....!!؟

* * *

لە فرمێسکی .. «کەندە دڵوپ»ە . کوپەی مەی
بە بێــەوەی دەنیم .. شەوانە بێ‌ئاگا ....!!
تاڵە موویێکی دەمێنێ ... هەموو جارێ
نێوانی من‌و باخی بەی .....
هەرچی دەکەم ... دەستم بەو بەیە ناگا .....!!
چۆن وا بە سانایی .....!!
لە سیحری دیتن‌و کوێریم دەگەن .....!!؟

* * *

لەبەر بای تەلەزگەیە .... جنۆکەی بیرم
دێن‌و دەچن ... وەکو گەڕیدەی ون‌بوو
دەمێکە خولیای شۆخێکی ژیرم ....!!
کەی حەز ڕادەگرێ ... دڵێکی کون‌بوو .....!!؟
کەی پیری کۆسە
لە گەردی نیازو نەوای پیریم دەگەن .....!!؟

خالد حسين

# روژا تژی

روژا تژی
گەرمو رونی
گەر دەمەك هات
تە باركرو
هەمی گەرمی و ئەڤ روناهی
تە هلگرتو كر ناڤ دەڤی
هزر نەكی
كو وێ روژێ
یان روژەك دی
دێ بێژی من
تو بی رەڤی
چونكه هەمی تلیێـن دەستا
سەرو پییا
دێ تێك هەسویم
هند ئینم.. بم
كو ئەو بدەن
گەرمو رونی
پێ رێ ڤەكەم
بو ڤی دلێ
لڤێ ژینێ
هندە دژەنی

# خەونە کێویلکە

عبد الخالق سەرسام

شاشەو کێلی خەونەکانی
دووا تەمەنم
وەك گرکانێ هەناسەیوا
بەرەو ئاسمان بەڕێ ئەکا
چ دەستاڕێکە ئەیگێڕی
کەبازن و ئەنگوستیلەت ... توریسکە ئەدەن
وا ئەزانم بە چنگ ئەستێرە
لێ ئەکەی
هاتم لەرەی سینگو مەمکت
لەسەر کۆشا هەڵگرمەوە ..!!؟؟
خۆم دی وەکو مێروولەیێ
بەسەر گوێی کراسەکەت هەڵدەگەڕێم
جارجار وەکو خاڵ خاڵۆکە
بەسەر پشتا وەردەگەڕێم ..!!
باڵم نەبوو بچمە وولاتی بێسنووری
سەردارەکان ....
بۆیێ لەتەك پەنجەی سپیت

لەگەڵ دەستارا دەگەڕێم
دوێنێ لیوت قاوەیی بوو
ووتم دەبێ تام قاوە بێ
خەوەکوتکەی تازیمانەم
هەڵفڕێنێ ...
ئیمڕۆ لێوت لە پەنگرە گڕێ ئەکا
زۆر ئەترسم کە پەڕیزی لێوی ووشکم
بسووتێنێ ....!!؟! ...
گەر دەستاری دەستی بە بازنت نەبێ
شاشەو لە بان شەو لە رۆژا ...
ئەتۆرێنێ ...
دەبم هارە ... دڕکی ئێشی ساڵەکانم
دەنووك بڕکە
دەبم هارە گیانو جەستەم
لەسەر یەکا کپو سڕکە .

○

# «پیرەکان»

## اسماعیل انور بەرزنجەیی

ئەم دەبووە گلۆرەبەن، شاخ گڕیٚ دەدران، چیا... شەوان دادەخرێن، تەعبیر، لە هەمیشەیی دەکەن، خوێیان، ئەمانەتی پیرەکان دەدەن، پیرەکان... نانوون، دڵیان بە ئاگر دەسپێرن، ئاگر چاوێکی لە ئاو و چاوێکی لەم زیندووستانە، زیندووستان.. سنووری نێوان دەنگ و ڕەنگ.

دەشتایی

ئەشقی سێ ڕووبارە

هەر شەوەو یەکێکیان هەڵدەمژێ

ڕووباری یەکەم: سوور

سوور

سوور

« پیرمەم »

ئەم دەشتایی‌یە بەخوێن ناودێر دەکا

ئەم دەبووە ڕەنگ، ڕەنگ دادەباریی‌یە سەر دوند، دوند دەکەوتنە هەڵەکەسەما، بانگی شایلۆغانی « هەتا مردن بەرەو بەرزایی » یان رادەهێشتا، کێشەکە قووڵتر دەبووەوە

بەفر

ئەشقی سێ چیایانە

هەر شەوەو پەردەیەك

چیاي یەکەم: خەم

خەم

خەم

« پیرمەگرون »
ئەم بەفرە بە قوربانی ناودێر دەکا
تەم.. دەگەڵ هەنگاوی ژنان هاوتەریبە، دەیاز بارێنتە نێو ئاو، دەنێو ئاڵۆزی یاندا چەندین لەزەت و نهێنی دەچێنێت، ئەفسانەی گەوزین و هاوتەریبی دەخولقێنێ
زێ
ئەشقی سێ دوڕیانە
هەر شەوەو هەناوی یەکێکیان
دوڕیانی یەکەم: ئەڤین
ئەڤین
ئەڤین

« پیرسێودین »
ئەو زێیە بە بادینان ناودێر دەکا.
چیا قفڵدران، بنار لە چۆلەوانی مارەی بڕا، ئەو دیوە خۆڵەو دۆ، ئەو دیو بایەقووش و سرووودی بێزاری و بێداری، پیرەکان هەر بەخەبەرن، وەبیریان دێت کە ژن و مێرد لە بەهەشت دەرکران، پیرەکان... تاڵە رەشەکانی رۆژگاریان دەهۆنییەوە، بە دۆزەخ ئاشنابوون، ئاگریان... دزی، خوارد.
بازن
ئەشقی سێ زەندە
زەندی یەکەم: تیشك
تیشك
تیشك

« پیرخەل »
ئەو بازنە بە زێڕی رەش ناودێر دەکا
تەم بووە بۆن، کێشەیەو ئاڵۆز نۆزدە سەدە، نۆزدە دەقی فەلسەفی داخراو، نۆزدە خەرەندی پڕ لە ئاکام و مەرگ و بێهودەیی، پیرەکان هەر بەخەبەرن، کە پیرەکان نووستن.. گوێ لە نەفخی سوور دەگرین.

٢٤ / ٤ / ١٩٨٩

○

# چەند کورتە هۆزان

بدل رڤو مزوری

## ١- سویند

هەمی دەریا دێ شلقینم

هەمی وەلاتا دێ بورینم

ته‌ڤ په‌یڤێت ڕندو سپه‌هی

دێ جه‌مینم

دا بکه‌مه ستڤانك‌و سینگێ ته‌یێ به‌فرینی

پێ ب نه‌خشینم

پێ ب نه‌خشینم

## ٢ـ مه‌تین

مه‌تین .... مه‌تین

ئه‌ڤروکه ...

گوڤه‌نده‌کا بوشه

هه‌می زاڤانه‌و

بویکا هه‌میان

دبێژنێ

«برین»

١٩٨٩ ـ دهوك

## ٣ـ خانم

خانما من ...

ل روژێت زستانا سار

دناڤ روندکێت گه‌رم

دێته وه‌رپیچم .....

هه‌ر دبارن ..... دبارن

ل ڕوژێت بوهارێ ....

پڕ خوه‌ش

دلێ من بو ته نێرگزو بنه‌فشن

١٩٨٦ ـ جلولاء

## ٤- نەوروز

گەر ...
تەیرو تەوال ل هێلینان
نەمان
نێچیر ڤانێن خوشیان
لدیف هەلبەستان
بەزیان
ل وارێن خوشتڤیان
وارێن بابو باپیران
ئەڤیندار دگەریان
هەلکەن چراێن ئاگری
ل سەرێ گارەیو مەتینو سپیان
نەوروزە ل وارێ مە

١٩٨٩

## ٥- من بینە بیراخو

تورینامن ....
دەمێ دبینی بڕێت قازیقولنکا
ل ئەسمانا خو دهەلاڤێژن
ڕوندکێت پیروز رویێت دەیکێت
شەهیدێت وەلاتی دنەخشینن
دەمێ دبینی
شورەشکێرەکێ فەلەستینی
شورەشکێرەکێ وەلاتێت بن دەست
ئار - بی - جی
ل سەر ملا دگرتین
من بینە بیراخو
من بینە بیراخو

١٩٨٦ - مویسل

ه خالد جوتيار ه « بۆ هەردوو هونەرمەند ئامانج و هاوتا »

دمدم دەقى سەر زارانى زۆرە، كارەساتەكە خۆى لەگەڵ جەوهەرى بيركردنەوەيە. بەلاى منەوە كەلەپوورو هاوچەرخێتى چربوونەوەى بينايى هزرە لەڕووداوى ڕيشەقووڵ.

ئەو چەند دێرە ساتە بێزاريەكانى دمدمى خۆ من وەك بيرو لێكدانەوەو مەرگيش پێى دەڵێم « لاوك » بەلام ناكرێ بچێتە مەيدانى پێشبركێى فۆكلۆرى.. !

ئەمشەو دمدم چەند بەسامو مەرگى ئازيزانت غەريب
كۆستى ئێمەى سەرگەردانو... زايەڵەى مەرگى ئاواران
هەور داباريية قەلا... چارەنووسا ناديارىَمە
خزا لێژايى زەمانێ... خانۆ ڕابە...
مەيلى سەربردان گرانە سەرگوزشتەى تەمەن پيرە
دڕابن كور گەلۆ.. پيرو زارۆكو ژنان
دەرينەوە لە كورەى ئاگرێ خەمان
جىَى ژوانێ لە كيژوكارێ دمدمێ بوە
حەسرەتى زەمانێ
دهايێ خانێ من هايێ
خانێ دەست بەسەران دڕابە وەرە زەيندە كيژۆڵە دەندان

دەست بەشیران بە خەنجەران
دەچنەوە رێیێ کانی‌یێ....
سەرو کەزی رەش داگەڕان
گۆزە لەشان.. لەکەیفێ پیرو شەرکەران
دەنگی ئەوان کیژە کوردێ دمدمیان، لە گویێ من چەندە خۆش دێ لە بەزاریی قەلاێی دێنە خوارێ
بە چریکەی بالۆرەو لاوکان
دیسان پایزێ خەمان لەمنێ ئەڤینداری بەلەنگاز
چەند بە کولو کۆڤانە
شەڕەکێ گەلە گران دەکەوتە قەلایێ بەبرین
لە کورگەلێ دمدمێ دەبوەوە تانو هەللایە
وەرنە زەینێ کەنیشکە دمدمیان، دەڤێ دەستان
نانێ ئامێزێ، بەدەنگەکی بە جەوهەر گاز دەکەن
خانێ.....
خانێ خانان مێرێ مەیدانێ، خەنجەرێ رۆژێ لێ قەومانێ
حەرام بێ لیمان چاوێ بە کل دەستێ بەبازن
شەوە ڕاموسانێ ژوانێ
با نەبینەوە سەرێ کۆستان، لۆمەی عەبدان گەلە گرانترە
لە عەزابێ قەبری
دەتو ڕابە ماتو نزانی خانۆ
مردوێ خەلکێ مە بە عالەمێ خەو لێکەتینە

رۆندکا چاوێ خۆ دکەینە ئاڤا کانیا
مەرگێ بە کەسەر بۆ ئەوان زەمانێ بزر

* * * *

خانێ برادۆستێ... دەهاتەوە سەرێ مەیدانێ تانی دەدا
لە کورگەلێ، دەیگوتە کیژۆلان، پیرە دایکان
لەگەل دلێ بە برینێ خۆ دوایمە
خانێ شەرێ بم، خانێ جوانان، خانێ خەمان

دنیایێ بەمردن بۆ خەڵکی قەلاییێ پیرە دمدمێ
بکەمە بەهەشتی رۆژگاران، زامێ یادان
هزرا من گەلە دوورە، جوانی هی دلێ من بوو
کۆست لەئێمەی سەرگەردان گرانە

* * * *

وەرە خانۆ با پێکەوە بکەین ڕایان تەگبیران
لەشکرێ نەیاران لەمەییان گرتیە ئاوێ کانیان
هەورێ رەحمەتان خانۆ
گەلە درەنگ بەسەر هەواری فەقیران دەبارێ
هاواری خزمو دۆستان لەمە بویتە کۆستێ مردنێ
با چیدی خەمان ناوێینە سەر کەسەرێ
وەرە با پێکەوە بمرین زەمانەی مەرگی تێکرایە
گیانی خۆمان بکەینەوە دیاری لۆ ئەوان رۆژگاری دوور
زەمانەی پر حەزو ئومێد، داستانی پیرە دمدمێ
بکەینەوە رازی دلان.

* * * *

نەشەوە نەرۆژە تەمان دەیگرت بەری قەلاییێ
هەورێ سپی دەبوونەوە کفنێ دەمدمێ رەنگین
شەرە لەکۆچگەو چەپەرا ماڵە دمدمیان
گەلە بەسام دەهاتە بەرگوێیان هاوارێ داکو بابان
هەناسەی زارۆکا
سەدای ماڵئاوایی دلبەران... خرینگەی خڕخاڵێ بوکان

داك لەپێش کوران... زایەڵەی دەنگی غەیبییان
سەدایێ دەنگی غەیبییان
دەکەوتە مالان... مەیدانان
مردنێ سەرشۆڕان ترسنۆکان. بێبەران
ژیان هی مێرانە بەهاری تەمەن لەمە بویتە گرێی زەمانێ

دهایێ دمدمۆ هایێ
خانمان لەمەیان گرت سەرێ بورجان، وەرن باپێکەوەبمرین
زەمانەی ڕەشبەڵەکی مەرگە
با خۆ هەڵدەنیەوە دوڵێ نەمانێ بەرامبەر بەردی شمشێرخانێ
مەرگ باڕامان بپێچێ. مرازەکان دەگەڵمانن.
قەلا ژمە جوان بووی. هەر ببەوە گۆرستانمان
ئەگەر رێبواری زەمانە سەری لێدای، ئەسپەکانمان دیارە
سەرەکی کانیان بدە.
پارچە گۆزە شکاوەکان ئێسکی کیژە دمدمیانە
بوانی دلداری کەلاوان
ژوانی دلداری کەلاوان
ماچ لەسێبەری کەلاوان
ئێمە حەزی رۆژگاری ترازاوین، وێرانە قەلای ئارەزوو
ئەمشەو سەرێ لەخەونم دە
دەفەکانمان بنێرەوە، با شمشێرەکان زەنگ نەگرن
باسوخمەی سەر مەمکی کچان، هوڕەی زەمانەی لێنەدا
باڵندەکانی دمدمێ سێبەر لەو مەیتانە بکەن
رێبوارەکانی دمدمێ ئێرە سەرگوزشتەی مەرگە
ئێرە کوێستان و گەرمیانە ، لە پەرگەی ماڵەکان خانۆ کاڵتە ڕاوە میژوو دەکرێ وەرن
باڵندەی دمدمێ نامەی باخەلان بەرنەوە پێمان بڵێن کێ لەماڵەکانمان دەژی .

* * *

چاوی سێبووریم کەوت پەنجەم بەکلۆپەکەوەنا
موتوربەتی خواوەندیم بانگدا
وەشاندنی تەماشام کتوپڕ ساردی هاتنێ
مردووەکان دەستیان لەبەرو باخەڵی ئەوکیژانەن تازەدەکەنێ

O

# ئاژن

بەشێکی چامەیێکە

سەباح ڕەنجدەر

چاوی سێبووریم کەوت
پەنجەم بە گلۆپی حەوشی ئاسمان وەنا
موتوربەیی خواوەندیم
پەلکی سێبەری فڕێدا
وەشاندنی تەماشام کتوپڕ ساردی هاتنێ
زەیستان دەستیان لە باخەڵی خەونی بەتاڵ

ئاژن

چیای لەئاوی کاکۆڵی ئاوەدانیان
خۆڵ هی ملسی نەخۆش
ڕۆخ باوێشکی تێکەڵکردن
قەترەسێ لەناو پەنجەرەی پەلکانی دەریاییێکی بازنەییدا کچێنیدانا
تەنیا کووفەك ماون
بەبە تانی مەڕەداران داپۆشراون
فەقیانەی من بڕ کێشی کفنان
ئاوچاوی کوڕنەبوایە
بەلەشی نە رموشلی کیژان ڕوشکنەدەبۆوە
ختوکەی خاولیو لاسکە لاسکی شلبوونیانی دە دان
خووسانی شەختە تەکینی خۆڵی ڕدێنم
ئا

سبەینێ چکارەساتێکی پەناداوە
کێها دامەزرۆیی لوولەدەدا
کە نجێتیم بووە گردە خۆڵ کانێك خۆڵی لێدەخوا
لەبن‌بەربوونەوەی بارانێکی نابووت ساتمەی با بە ژێرداچووم
رووناکی باڵی سیسارکێك خەونێکی تەواونەبوو
بەندۆخینی بەفرێ گەرمی دڵی خاکی‌بەست
مەل چهەلگرێتەوە
نە یتوانی کەوشەنی جێپێیانی ببە زێنێ
خۆدیکی پێی تێفرێدان‌و باسخوون‌بوو
ئەوشەقامەی ئیوارانی لێزەرد دەکەی

واق ورمانی رۆژ

هەتاوی زستان هێشووەدرۆیێکی بەردایەوە
درەبای شەرمەندەیی هەمیشەیی
سێبەری رەنگبە هەشتیش
ددانم کە لبوون
چمکی پژ دێنی مردووان ئاوی خەونیان هە لگرتووە
باعارد جارێك دیلی بەفربێ
مردووەکان سەرمایان‌دەبێ
کە نجێتیم شەپۆلێ بوو لە رۆخان شکا

رامانم‌لە ئاوێ دیل

لێرامێنە
غاردانی عارد دانیشتنی سەراب دامانی سروشت
لیچایی هێلنجی بێئاگای‌سەردەم
لە رێژەنی تێپەڕین‌و گەیشتن بەکچی ئاوی
بهاتبا گۆڕم نزم بوو هەوێژدەبووین
ئا
بەلێ
سەنگایی بەردێکم پێرانەگیرا
سێبەر پەرتبوون ماوەی نەدام چاوگەرمکەم
لەبن‌پێستی فریشتان میلی کاژێری تەمەن‌گیرە
گۆران لە کارێزان

سێبەری کە سیرەییم ئەوەندە چاڵەبەفری لە پەنجە بازی هەڵم خووساند
شەرەگە ڕەکی مانگەو ئەستێران‌هە ر نەقەوما
ئاوەدانی ئاوایی من‌و سێبەرم لەهاوارەتای نە گونجانیان دەن
کیژێنی خاك کوڕێنی ئاو پیربوون یان مزگێنی زانیان پیربوون
لەشەو شکانیاندا شەوەلووکەی کەڵەبابی زیزان نەیکرۆشتن
نینۆك لە دۆزەخی ئەوان دەدەم دەچمە دیدەنی خۆم
چیت بە خۆت گوت
خۆ هە ڵقولان مۆنج‌و ئاوەزتێکچوون خواژماردن
ئەوژنەی لە ناو هێلکەی شەیتا نۆکە کراسی هە ڵماڵی
زگی دانا

مۆمیایێك دەمی دەکووتێ
تاقمە تراشێکیش دەشوا
دەستەکانی لەعاردی دەخشاند
لە ناو ڕەوینەوەی خۆی سپی دەبریسکایەوە
گلۆپی خواش چلکی لێهە ڵدەبوون
پەلکە مێوی حەوشەی مەشایەخان
پووشی رۆژ نووستووی شەمشەمەکۆران
دارەبازەی گە نجێتی‌من
پرچی شاخی ئەم بوونە گوناهە رووهات
دیارەسەرابی زۆر لێبریسکانیەوە
خوائاوی تەماشای بەرامنەبوون‌سپارد
خەون‌دەیگێڕن

ترپەی کووتانی گۆپاڵ
لە دوایین پێچی ئەوبیر رۆیشتنەم دەکاتەوە
بە ردەپیرۆزە ددانی کەمتیاران
نۆرەتای ئاسن لە گەشکەی من کە فیهەڵدا
نەویان هە ڵدێران دەستم لە بژی ئاونا
فرێیدام

دەکرێ کۆڕەوشارم پەنجەی ئەسپێکی ئاوبێ
پرچم دارستان موکناتیس
بەسەریابێی تۆزی ناشتنی ئاودەتکیرسێنێ
دەنووکی سەمەندەر باخچەی چەندمەتری ماڵان
گوڵەئاوی گۆنای پەری بەخشندان
لاتەرۆکی گەرمایی چنکە ئاسنیبەرمەنکە نانی لەباڵی مراوییاندا
ئاویش گیای گیری تێڕواون
تەنیدەچی خۆشەویستی خوویێکی شەڕانە
چیتێدەچێت داوێك لەتەماشان هەڵبێ
ماڵی ئاپووورە سەراب پابەندبا بەندەرگوڵم
پەنجەکانم جومگەی کەوتن
لە بن خووری بیرەوەری سەرمام بووە
دەنومەوە
چوار دارەم بە کۆڵانان رابوو
بەچیمدەکەی بەبەڕێکردنی مەرگی خۆم رانەکەیشتم
گلۆپی نیپۆنەکە چاوی رەشبوو
دانیشتنی مانگ
ترپەی پێ هاوێشتنی بۆقی ناو جۆگەی خۆشوشتنان
ئەوەی لێجێما

پێلۆزیپیاوانی لەناو خوێن گرتنی هەڵخستبوو
خۆدووانی نی ژنە تەمەن کەوتووەکە
شەرمەندەیی خانەی مێینەی خەولێخست
بەفری خۆویستی رزی شەهوەتی داگیرسان
ئەوکەناریکی کورتبوو سێبەری وی نەگرت
رۆژهەڵات بوورانەوەی ژنێکی ناشیرین
مێژووهەڵچوونی بە تالکرد
پەرتبوونی چاوەڕوانی لەکەوانی نێوەند هاوێژی مردندا
دەستەمۆیە سەرەتاییەکانیان
لە ئاکارێکەوە بۆ ئاکارێکیتر نارد
ناکۆکییەکانی کۆتایی رووتبوونەوە

بۆماوەیی نییە خۆپنجگیری ڕەشایی پشت خۆرسککەی
گەرمایی ئێسکی مردووان شەختەی ڕێکەوتیان بەهەڵدا
پێوانەی پشوودان بگرە
پەنجەکانت پەنجەرەی ژوورەکان
زەردوویی ڕەنگی ئاشکراکردنی تێگرتم ماسی ناو تەنکە ئاوان
پەنجە یان لە بن سامانی ئاو ڕاخستووە
پەنجەکانی هەوری ئاو تلیشەبەرد
فڕەفڕی باڵی ئاورۆنکە تێکمدەدا

لەناولە ڕزەی ڕۆچووندا شەمەندەفەر گوڵە بەڕۆژەی مێژوو دەکرتێنێ
تۆزکاڵێك نەرم ببارە گەنجێتیم گەچەرۆ قۆریەیێکی قوڕینیچا
سوپاس کوڵکە کریستاڵەکە
ئەوبایە بۆشایی
نیشتمانی ڕاکشانم لەچلەی مردوویێکی سوسەنە کداری دەدا
گەلێك شت لەبەستنەوەی ئەسپێك بیندرا
سنووری ماڵ گۆڕستان پەرچوو گرێدان فابریقە ئاژێر ئاژن بێئەنوایی
بزانم خۆم لەم ئەسپە داناگرم
کیژی گومان لەناو هێڵی ئاوابووندا
دەستەمۆی ئاە ئاە ئم ئم هـ هـ دەبێ وپەنجەی تاسەکانی دەمەیی
قوم لەدووکە ڵی خۆت دەدەی ئە ودووکە ڵە مەدەوە
بازێتر بچە ناو نەخشەی ئەو لاکێشەی گومانت دەگەزێ
دەڵێن مردن بە منداڵیەتی خۆتت دەناسێنێتەوە
مردن منداڵیە کەی لەئەزەلا ئاوی ڕەنگرێژمکە
کۆماری تەنیاییم لە کلۆری هێلکە یێکدا
لەبەردەلانیپەڕی قوو
لۆچی دواشارستانی تیزاب دەمرێنێ
مافوری پرچی کیژان
یان
گیای پەنجە لێکگرێدراوی حەسیری ئارامی

پەنجەکانم لە ناو منداڵدانی سەرم نینۆکی لینە هاتوون
سۆراخم لەغەیبێ

ئاوابوون مارێکی بەڵەك
ناوشاخان تەواو روونبۆوە
منداڵانی لە رووبەری زمانی تیسماحێ گەماندەکەن
رەنگی گۆشت ووزەییێکی خواوەند
کەڤ پیرییتی پرچی گروازەی ئاو
ئە وجۆکەلە لەشەقاو بەرینترە بە ردەبێ لە کەوای پێخەمبە رجێما
هەڵدەخلیسکێ

زێڕی ناودەقی کراسی کچە چاوزە ردەکەی
مەگێرانی بەشەر مەندەی ئێوارەیێك دەکا فریانکرد
ئەزیش تیفە ڕۆبووم چووین چش
دیواری برژانکە کانی لەقا چوار راتەکانی کارەبایی
دووسالو هەشت مانگ لەبن ژێر کراسی خوێی سربوون
پەنجەی بیرەوە رییە کانییا پشتەو شکێنکزد
لەئاسایێکی خواسترا ودا دەبیندرێ
گەرمایی پەنجەکانم لەناولۆجی سایکۆکات گۆڕا
کووتانی باران لە پێدزەی پیاو خراپان دەچێ
گوێ لولێدانی دڵێ بوو کە شوشەرادێری
سلوێنی وولاتی سێیەم
نۆژەنی ئە لها یێکی تەنك بوزای نادرە سیمای با
سبەینێ ژ نێکە لەبن لێفەی گوناح
چەورایی پرچی شەی هێسك
لە هیشکایی ئاو چای یە کرەنگ تێکدەدا
ددانی بە فلچەی بەرد دەشوا
هانینۆکێکی تری پەنجەی بیستو یە کەمینم
سییەکانی ئاو بەزنم
باسکی زەنگیانەم رووباری گروازەی مشکی ئەڵماس
ئاوی بوو
جۆگەیێ پشتی کەوانبوو
قومێ ما
بۆقێك ئانیشکی بەبالیفی ئاودادا
لەپێکدا چوونو کەوزینی دەقنە شکلوی تە نێ راما

بائەو ڕێیەش بکشێتەوە ناوملی خۆی ناکەوسەجێ
وڕێنەیێکی تری پەراسووی گردی پەنجەکانم
ئاگاداریێکم دەداتێ
تەمەن پێنج سەدەبێ چاوەڕاونیت پەیکەر تابووتی شەقاموەردەگرێ
ئێسکی پەشێمانی برادەرایێتی داتاشێنم بە هێزدەکا
پەیکە رێکی ئاوم هەڵنا
پێڕا نە گە یشتم

پەرچووی منداڵدانی ئاوابوون بووین
گلۆپی لێدووانت لەئاست چیمدازەردەکەی
ژووریکی پەنجەرە کوێروقامیشبەند
ئاوەز مە لبەندی بەدوا داچوون
کاڵۆس کلۆرۆفیلی بەروئاوی بەخششی هەڵبزرکاندم
کە نجێتییکی مەند
پەنجە بەگلۆپی ویستت وەمەنێ
تارماییم خاکی ئە ستێران پە نای‌دەدەن
رنۆکی پیلاوی چیا
سیمابەستەی کەمەری نەو بیان خورتبوون
قومی‌بیابان لێهەڵبوونی شاخ
پرچی‌کچان لیفکە
نەمێردی سروشت لە پشتی‌دەدا
یەکبەندی
سپاردنی وێنە دەنگییەکان
زەردبوونی ئێواران بۆنی کپی‌و هەناسە دانەوەی کەنجێکی
زەردبوونی من شتێکیتر
مردم کراسەکە م هاوڕێیێتی نەکردم
لە تازییەشم دانەنیشت
بەرد هەڵپشکفتنەوە
کۆتایی خۆم‌پێرا ناکیرێ
ئاوسەرمایان دەبێ
سیسبوونی پە نجەی پیرییێتی خۆم‌بینی
ئەڵقەشم لێبەر بۆوە
تامەزرۆییم نەترووکا
پەیکەر سەرمایان دەبێ

---

سەرنج:

١ ـ کەسێك بـۆ کەسێکیتـر لە بۆســەدا خۆی ماتدەدا لەپڕ کەسی دووەم دەردەکەوێت. کەسی یەکەم بە هەشتاوی پڕکێشی کوشتنی دەکات ● ئاژن ● ئەمماوە کورتبڕەی نێوانیانە.

٢ ـ ئەم چامەیە لە نێوان ● ١٢ ـ ١٠ـ١٩٨٧ / ٢٨ ـ ٥ ـ ١٩٨٩ ● دا نـووســراوە. ئــەوەی لێرەدا دەبیندرێ بەشێکیتی.

عباس عسکر

نوێژی ئارەزووی دڵ قاو دراوم
ڕێگای مردنێکی بێ رووبارە... ! !
شمشاڵی، بێ دەنگی چەمی
ئاهەنگ کلوڵم.. !

قەوارەی زامی برینی
وشك هەڵگەراوی.. بێ ئارامم
قەتاری (شەلاقە) کۆچەرەکان
بەنازی ئاسمانی
بیوەژنە خەمناکەکان
بەسەر تامەزروویی
نوێژی هەنگاوی بێ ووچان بوونم

لە بێکەسی شەوانی
لافاو بردووی... ! !

شان بە شان
وردە وردە

دەگەشێنەوەو
ئۆقرە دەگرن
بەسەر ئەرکو ئێشی
رووخساری بروا... وون بووەکانم
دووبارە...
شمشاڵی بێ دەنگی
دەنگێك... دەدرکێنێتەوە
بۆ
دووبارە..
ووتنەوی
هۆنینی هۆزانێکی
جوانتر... ! !
بۆ شیدا بوونی
ئەو رووبارە
لەسەرا خۆ جووەکەدا.

○

شەلاقە . مەبەست . نەوعێکە لە باڵندە (کۆچەرەکان)

# جوانەکانی دۆزەخ

● سامان دزەیی ●

ناکەمە کەوتنی سێبەرت
ئەویش دەتارمێو باوەشی ئاتوونەکان بەجێ دێڵێ
ئەویش وەکو پێڵاوی زێ
ئاوێنەی خۆی ناداتەبەر پچڕینەوەم
زمانی بەردیش دەتەزێو
بە سەر یاتاغی ڕێکادا شۆڕدەبتەوە .
نەتویبست چنگێك لەرۆحی دۆزەخ بدزیتو
بە دەنگی دووریتی وەرکەی
نەتویست بەگەر نەهەنگی نەفرەتم کەوی‌و
چاڵی بەهەشت تێزای ژیان لە ئەشکەوتت بدۆزمەوە
نەتویست ، گفتتم دەدایێ
بە ناو تاریکترین ئەشکەوتت دابرۆم ئاوەدانی بکەمەوە
سواری شێت ترین شەپۆلت بم و هێمنی کەم
گفتتم دەدایێ بە جەنگی خۆمت شادکەم .
بۆکێ نەگریام ، چنگێك خۆڵ نەڕژاندە ناو پیاڵەم
لەپێك قژی لە پەنجەکانم نەئاڵاند
بۆکێ سەرم نەکردە شووشەی هەتاوو
گەمێی تاریکی‌ی نەدامێ
هەتابەردیش تاریکی کرد
خۆمو تاکە پێڵاوی ڕێ

هەناسەی دارمان هەڵگرت و
سیپەلاکی ڕێمان ماشی
خۆم وزستانی باڵندە کۆچەرەکان
تەونی جاڵجاڵۆکەی دۆزەخ بوو بەماڵمان
دەنگمان بەو دیوارانە دادا
دەرگای بێ‌ماڵ ڕای گرتبوون
ئەو پەری‌یانەی مێوانداری‌یان دەکردین
سەردەمێك بوو
لە ماڵداری خەونی ڕەبەنیش کەوتبوون .
لەمەچێتر خەونی ئەوشۆیان گۆزتمەوە
لەمە چێتر ئەسپی مێژووی نهێنی‌یان
بەڕەللای ناو پێدەشتی تارمایی من کرد
ڕۆح هەروەکو قوشقا قزێك
تاڵەداوی بەستانەوەی بەجەستەی مندا پچڕابێ
بەڕەللای بۆشایی بوون بوو
دیار بوو یان لێم بزر دەبێ
یان شاگەشکەی ڕۆناکی نهێنی‌یەکان دەیسووتێنێ
ڕەوەگورگی بیرەوەری هاتنەخوارەوەی من ـ ئادەم ـ
لە جیوەی ئاوێنە چاوی هێلکە شەیتانۆکەی ئیبلیس
تینوێتی خۆیان دەشکاند ـ دەشاردەوە
(پێ .. لە .. هەنگاوی .... من ... کۆجە)

ماندووتر لە تاشەبەردێکی جێماو
بنی قووڵایی داهاتوو
زەری‌یەکانی دۆزەخ دێن دەوردم لێدەدەن
دێن سەمای گڕی جوانی‌یان لە خوێنمدا دەکوژێننەوە
دێن لەزەماوەندی تایبەتی .
جەنگەڵی قامیشە کەونی‌یەکان
نهێنی ئاوازی باوێر
بۆ فریای من دەدرکێنن

ـ دێمە ئاستی خۆ دركاندن ـ
كیمیای ووشە
لەناو پیتە هەڵێنجراوەكانی شاردا دیلمدەكا
دەمزانی لەڕووی شار برین بووم
پیتەكان پێكیان وەدەنام
دەمی هەزاران شمشێری كوێ وەك خۆم
ـ مەبەست تیژتر ـ گرێدەدران
شەپۆلێكی لە باتیژتر
لە ـ بۆ ماوەی ـ هەموو شعری دەترازانم
ـ چی لە كیمیای خۆڵ جیاوازم دەكاتەوە ـ؟
لە مە چێتر پێیان گوتم
دێتە پێش مێژوو ڕووكەشی
ئەفسانەی هاتنەخوارەوە
دەبیندرێ و
نادركێندرێ !!
دێتە پێش مێژوو شاعیرێك
فاڵ بۆبەختی سبەینێی خۆی دەگرێتەوە .

○

# گەڤالێ ژینێ

**- پێزانێ ئالیخان -**

ما ژین چیە.. ! !
ژین: ئەڤینە
سەرخوە بونە، سەربەستیە
ژ خورستی، ژ هێزێ دبت
ژین کوترەکا شاپەرسپیە

خونە هەسپە، ئان بالگیرە
داب قامچیا
فرادەتن

نە زیندانە
برێڤە بچت

هەرچار رەخان
دیواربت و
دژێر تیخێن زەڤیا رەشدە
مروڤ دنێڤدە
نەئیڤنە، ئەلیف و بێ

نە شیرەکێ دەڤ بخونە
د شەرە نیخا ئەڤینێ دە
دشورەشا سەر بەستیێ دە
سەرێن بێگونەهان
برزت

سەرێن پەرندان ببرت.. ! !
ببرت... ! !

# هەناسەی پایز

موزەفەر سلێمان

١٢ / ١٢ / ١٩٨٣

وەك چۆن هەستی قووڵ
بمگرێتە خۆی..
لە خامۆشی خۆی بملاوێنێتەوە
هەناسەی زەردی ئێوارەی پایز..
ڕەشماڵ ژانی دەربەدەریمە
سەری غەریبیم دێنێتە باوەش
دووری‌و بێ ( ئەو )یم بیردەچێتەوە..

* * *

چەند بە ئاوات بووم ئێوارە ساتان
لەگەڵ بێ ( ئەو )ی‌و تەنیایی خۆما
شیعرێ هەڵبەستم
وەك ( ئەو ) جوان بێ
گەڵای زێڕکفتیش دابکا بەسەرما

* * *

ئاخ بۆ ئەو چڵانەی لە کۆشی کوانەووی
سرەی زستاندا دەبن بە سووتوو..

○ مەسعود پەریشان ○

## کوردستان

مەسعود :ـ من چی ئێوەم
جوان :ـ عێلو عەشیرەتو ژیان
بنار :ـ باوکو پەناو پشتو ڤیان
بێوار :ـ خۆشەویستیو سەرو سامان
مەسعود :ـ ئێوەش بۆ من کەلێ کەلێ گەورەترن لەو شتانە
بەلام لە کشتمان گەورەتر خاکو خۆلی کوردستانە

○

## بنار

درەختێکی بە سالاچوو
لە نێو لقە پیرەکانیا
چرۆیەکی دەرکردبوو
داوای موتوربەیان لێ ی کرد
-گوتی با چرۆ بەهاری تەواو بکات
رەگی دەخەمە ئامێزی
خەنەو خەرمانیان داوا کرد
- گوتی با بەهار تەواو بێ
چرۆتان دەخەمە رێزێ

○

## تارمایی

تەمێکی ئەستوور سپێدەی داپۆشیوە
-دەبێ سەر هەلدانەوە بێ
یا سەرەتای براتەوە
-نە ئەمیانە .. نە ئەویانە
خۆلەمێشی لاشەی زیندووی
بیرۆکەی باپیرەمانە

# وینە

فڕندەی هەر هەموو دنیا
ڕەگەز ڕەگەز لە زمانی یەکتر دەگەن
بە یەك جۆر دەفڕن بە جۆرێ چیتە دەکەن
کەچی مرۆی تاقە گوندێ
نە بەزمانو نە شێوە
نە بەهەڵسو کەوتو ژیان
بە هیچ جۆرێ لە یەك ناکەن

○

# بادە

- دوێنێو بەستر بەستر پێرێ
هەمان هەواڵ هەمان وێنە
هەمان ئازارت پێشان دام
- ڕاستە بەڵام
دوێنێ لەبەر گێکاو ئەمڕۆش بەرگێکیتر

○

# درەخت

- زیاد لە پێویست بەرز هەڵچووی
منت لە ژێر ئەژنۆی خۆتا شاردۆتەوە
- ئاگادارم
بەڵام دەزانم درەختی کورتە باڵا
بیرۆکەی زیندووی لە ڕەگی شاردۆتەوە
منیش تا بتوانم زیاتر بە ئاسمانا هەڵدەگەڕێم
هەتا ڕەگی زیندووی ئێوە
لەسەر سەری خۆم هەڵگرم

○

# دگەل هەڤالا ل مەیخانەکێ

هەڤالێت من
هوگرێت من
برایێت من
پێخوش حالم
لحەفیتێ ئێک جار
دگەل وە رینم
کو ل و کوڤانێت دلێ خو
ئێش‌و ژانێت جەگەراخو
بو وە دیار کەم بخوینم
ب کەمە هوزان
ب کەمە پەیڤێت نازک‌و جوان
بو وە لێکدەم وبڤەهینم
بکەمە دیاری و ئەز بینم
بکەمە دیاری وئەز بینم
xx xx xx
چاڤە رێمە بو وێ روژێ
روژا ئەم ئێک‌و دوو دبینین
لگەل ئێک درینین
خوشترین مەیخانەکێ بخو دبینین
مێزێ ژمەی رەنگ رەنگ دکەین‌و دخەملینین
پێکڤە را دکەین
خر پێکێت خوو دبێژین چرپا
توڤێ خوشیا لمە بریا
نێ مە جەگەر ژ بنی درپا
پشتی پێکی دکەڤین گریا

شریف ئامێدی

دکەڤین گریا

xx xx xx

دگەل پێکی ئەم خو ژ بیر دکەین

کوڤلنو ژانا دیر دکەین

ئومێدێت خو

بو ڕوژا زاڤلنییا خو

نێزیك دکەین

سەرێ وەستیای ژهزرو بیرا

دلێ کەفتییە بەر تیرا

ژخەمو ژانا

تەنا دکەین .. تەنا دکەین

xx xx xx

لێ ئەو کافە

کافا کو ئەم پێ دادکەین مەی

دکەینە هەوار

دکە ینە گازی

بدە نگێ بلند

دایکا مەزن کانولکیڤەی

وەرە تانامە ئەڤروکە

لهیڤیا تەینە ومەتو یاهەی

تو باش دزانی ئەڤرۆ مەیە چەکێ مەهەی

ڤێجا وەرە مەخلا سکە

زدەردو ژانا

ژمە یخانا

بومە دیار کە دەرمانا

هیڤیدارین یامەکری تووێ نەکەی

مەژبیر نەکە ،

تودا یکامەی ، هەر ودایکا مەی

# Pier Paolo Pasolini

## جەند نمونەیەکی شیعرەکانی...

# پازۆلینی

وەرگێڕ / یاسین فەقی سەعید

## شیعری یەکەم

## « ڕۆمانسیێرۆ »

کوڕم ئەمڕۆ یەك شەممەیە
زەنگی کڵێسە بێ ئۆقرە، پڕ زرمەیە
بەڵام، دڵم، ئەڵێی چڵی درەختێکە
گەڵاکانی هەڵئەوەرین، یەکە.. یەکە
بۆ ساباتە زەرد هەڵگەڕاوە دوورەکان
گوێم لە چۆلەکەکانە، دەخوێنن
تا ئەو کاتەی لە باوەشی ساڵەکانا
هەر زیندوو بوون
ئای... بەبەکە واهەست دەکەم
من و دڵم هەر دوو جووتە
لە باوەشی گەڕەکێکی
کاڵا سپی « فورلانی »[۲] داین..

* * *

هەموو ژیانم تێپەڕی
من کیژۆڵەیەك بووم ناسك
تۆ مردبووی
ئای.. ئەی ئێستا بۆ هاتیەوە
ناو ئەو خەونەی
ساڵەهایە لەبیر خۆتت بردۆتەوە ؟.

○

## شیعری دووەم

## نهێنی یەکان..[۷]

چاوەکانم، بەسەر چڵەپۆپی ووشکی
درەختەکانا، هەڵئەزنێن،
خوا نابینم،
بەڵام چاوم لە چرای پڕ لە تیشکی یەتی
لە گشت ئەوەی کە دەیزانم
تەنها یەکێ لە دڵەوە هەست پێ ئەکەم:

ـ لاوم. ئەژیم،
لەتەك لەشما كە سەرف ئەبی. جیٚ هیٚلراوە
چركەیەك، لە سەر چیمەنی كەنار دەریا
لە نیٚوانی درەختە ڕووتەلەكاندا
ئیستیٚ دەكەم
ئیدی ئەرۆم. ـەچمە ژیٚر هەورەكانەوە
لەگەڵ لاویـیما دەژیم

○

شیعری سیٚهەم

## دیٚوەزمە یان پەپولە ..؟

١)
ئەوەی لە ئاسمانی سنگما هەڵئەفڕیٚ
پەپولەیەكی بیٚدەنگە. ڕەنگ ساماڵی
لە تاریكی دەمارەكانی گیانما
بیٚ سیٚبەرە، بیٚ تارمایی..
نەء... ئەوە دیٚوەزمەیە، وابیٚ دەنگە
ڕەنگە ساماڵی یەكەی ژەهرە
بە چاوە ڕووتەكانی ئەو
تەماشا گەرمەكانی من، دەبنە شەختە

*　*　*

٢)
نەء، پەپولەیەكی سپی، وەك چۆڕیٚ شیر
ڕەنگی سپی هاوینی ناو هاوینمە
هەڵنیشیٚ یان بفڕیٚو بڕوا
من شادمان، هەڵدەدەم چاویٚكم لە ئەوە
نەء... ئەوە دیٚوەزمەیە
وەك تەم لە دڵی ناموٚما، گەورە، ئەبیٚ

بۆ چرکەیەك دەیبینمو
ئیتر لەگەڵ ڕاچەنینما، بزر ئەبێ

* * *

٣)
نەء.. ئەوە پەپولەیەکە
بەڕەنگی وەنەوشەی لاویم
وەکو قەیفە ڕەنگ کراوە
لە ئامێزی کاتژمێرە هلوتاکاندا
لە ناو وەنەوشەیی منا
خۆی دائەنێ..
نەخێر ئەوە دێوەزمەی شەکەتی یە
لە بلوەشی کاتژمێری چۆك داداندا
ئەقیژێنێ..
دژ بە هەموو
دوور لە هەموو ڕائەوەستێ
کوڵی منالکاری منیش
ئەژاکێنێ..

* * *

٤)
نەخێر ئەوە پەپولەیەکی جوانی یە
لەسنگەوە بۆ ئامێزم هەڵئەفڕێ
لە تەك ئەودا بە یەکسانی
هەتا سەر دەتوانم بژیم
گەرچی هەرگیز
ئەچێتە ئەودیوو منەوە
نەخێرئەوە دێوەزمەی هیوایەکە
لە بۆشایی نائومێدی (کازارسا)[٤]دا

وام لێ ئەکا، هەرگیز مرۆڤێ نەبوو بم
بە گومانێکی ڕووتەوە
کە هەرگیز نەژیابێتم..

O

شیعری چوارەم

## ئەو ڕۆژەی دەمرم..

لە شارێکا
(تریێستی)[*] بێ یان (ئودینێ)[٦]
پڕ باڵای شەقامێکی درەخت ئامێز..
لە ژێر هەتاوێکا دەمرم،
گەرمو ڕەنگ زەردو باڵا بەرز..
برژانگەکانم دا ئەخەم
ئاسمانیش لە جوانی خۆیا، بەجێ دێڵم
لە ژێر سایەی درەختێکی باڵا سەوزا
ئەکەومە ناو ڕەشایی مەرگی خۆمەوە
درەختو خۆر بزر ئەکەم
مناڵە جوانکیلەکانیش
بەرەو ئەو تیشکە ڕائەکەن
کە وونم کرد
لە قوتابخانەوە دەفڕن
قژیان لەسەر ناوچەوانیان
لول ئەکەن
من هێشتا هەرزەکار ئەبم
بە کراسێکی کاڵەوە
بە قژی جوانو خاوەوە
کە وەك باران
بەسەر تۆزی تاڵیما دێنە خوارەوە
من هێشتا هەر گەرم ئەبم

لاویٚ بەسەر قیرِی گەرمی
شەقامەکەدا ڕائەکا
لە سەر باوەشە شووشەیی‌یەکەی[٧] من
دەستیٚ دا دەنیٚ..

○

## شیعری پیٚنجەم

# وەک کزە با..

تۆ لە نیٚوان گوڵەکان‌دا
کە دوگمەی کراس دا دەخەی
وەك فریشتە دەڕۆیتەوە
دڵی منیش
ملی ڕیٚگای چارەنووسیٚ دەگریٚتە بەر
کە هۆگری کاڵی چاوەکانی تۆیە
تۆش بە پیٚوە ڕاوەستاوی
لە مردنی ئیٚوارەیەکی بیٚ مندا
خۆت وون کردووە
بەڵیٚ: وەك جوتیاریٚکی بیٚ تاوان
لە ئیٚوارەیەکا دەژیت
خۆشەویستیم وەك کزەبا
نەرم دیٚت‌و ماچت ئەکا

○

## شیعری شەشەم

# ڕۆژە دزراوەکان..

ئیٚمەی هەژار
کاتی لاویٚتی‌و جوانیمان،
ئیٚجگار کەمە..
ئەی جیهانٚ تۆ
دەتوانی بیٚ ئیٚمەش بژیت.

ئێمە کۆیلەی لە دایک بوونی خۆمانین
پەپولەین هەرگیز جوانیمان،
نەبینیووە..
مردووی لە ناو
قۆزاخەی « زەمەن » دا ئێمەین..
دەولەمەندان
نرخی « کات »[8] بە ئێمە نادەن
نرخی ئەو ڕۆژانەی دزران
لە جوانێتی ئێمەو باوکان
- ئاخۆ تاکەی
بەڕۆژوو بوونی « کاتەکان »

O

سەرچاوەکان :-

* بۆ ئامادەکردنی « کورتەی ژیان و کرۆنۆلۆجیای بەرهەمەکانی » پازۆلینی، کەڵکم لەم سەرچاوانەی لای خوارەوە وەرگرتووە.

١ - ئینسیکلۆپێدیای گەورە - دەزگای جوغرافی دیئەگۆستینی - بەرگی ١٤ لاپەڕە ٤٩٠ - ٤٩١.

Grande Encilopedia — Istituto Geografice de Agostini — Novara — 1983.

Volume XIV — Pag. 490 — 491.

٢ - فلیمێکی بەڵگەنامەیی - Documentario - بە چوار زنجیرە . تایبەت بە ژیان و بەرهەمەکانی پازۆلینی - لەسەر (ڕای - RAI) ڕادیۆو تەلەفزیونی ئیتالی - قەناتی (٣) سەرەتای ساڵی ١٩٨٧.

٣ - (Pasalini - پازۆلینی ) ووتارێکە لە کتێبی مێژووی ئەدەبی هاوچەرخی ئیتالیدا.. سەرچاوەی شیعرەکانیش «لاوێتی نوێ - La Nuova Giorent'u » کەنامیلکەیەکی شیعرییە ساڵی ١٩٧٥ لە زنجیرەی Supercoralli» دا چاپکرا... چاپی چوارەم ساڵی ١٩٧٧ . پاشان دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی « Einandi - ئیناودی » لە شاری (Torino - تۆرینۆ ) هەمان نامیلکەی لە زنجیرەکانی « Strutti»دا بلاوکردەوە لە ساڵی ١٩٨١ دا بڕوانە:

La Nuova Giorent'u — Pier Paolo Pasolini —

E inaudi — Gli strussi — N; 243 — Torino — 1981.

## پەراوێزەکان:

1 — R omancero) - ڕۆمانچێرۆ - یان - ڕۆمانسێرۆ ) بەو کەسە دەڵێن کە گۆرانی « ڕۆمانسێس.
— Romances بڵێ، یان بە کۆکراوەی کۆمەڵێ ڕۆمانسێس دەوترێ، ڕەسەنی ئەم زاراوەیە ئیسپانی یە، بە ئیتالی پێ دەڵێن (Romanza - ڕۆمانسە) ئەمەش ئەو شێوە شیعرە دەگرێتەوە کە تایبەتە بە گێڕانەوەی داستانی ئازایەتی وجەنگ شێوەیەکی عاتیفی، (ڕۆمانێس) یەکێکە لە شێوە ئەدەبی یە کۆنەکانی ئەدەبی ئیسپانی کە سەرتا دەماودەم پارێزراوەو ئەمڕۆ گەورەترین ئەنتۆلۆجیای بۆ ئامادە کراوە.. ناونیشانی ئەم شیعرە بە ئیتالی «-Roman cerillo » یە، کە مەبەست لە « ڕۆمانسێرۆ » یەکی گچکەیە.. بۆ ئاسانی خوێندنەوە من تەنها ئەو ووشەیەم نووسیوەتەوە.. دیارە ئەم زاراوە تازەیە گەڵێ دوورە لە « ڕۆمان » و « ڕۆمانی » و « ڕۆمانیسەت »ەوە.
٢ - (فورلانی ـ Furlano) یان (فریولانی Friulano) مەبەست لە دانیشتوان و ناوچەی ( Friuli ـ فریولی) یە کە دەکەوێتە سەرووی ئیتالیاوە، دایکی پازۆلیینی خەڵکی ئەم ناوچەیە بووە.. فریولانی یەکان خۆیان بە ئیتالی نازانن و داوای ئۆتۆنۆمی دەکەن. پازۆلینی یەکەمین دیوانە شیعری بەم دیالێتە نووسیووە لەبەر خۆشەویستی دایکی.
٣ - (دێوەزمە) من لە بەرامبەر ووشەی (Mostro) ی ئیتالی دا بەکارم هێناوە ئەم ناوە مەبەست لەو گیانلەبەرەیە کە دڕندەیەو تەنها زەرەرەکانی دەبینرێن و خۆی وونە. هەتا ئەدۆزێتەوە پێی دەڵێن «Mostro » منیش بەش بە حاڵی خۆم لەووشەی (دێوەزمە ) نزیکترو باشترو زیاتر شك نابەم، هەرچەندە ئەم ووشەیە مانایەکی ئەفسانەیی هەیە.
٤ - (کازارسا ـ Casarsa) ناوی ئەو گوندەیە کە شاعیر بەشێکی زۆر ژیانی تیا بەسەر بردووەو دەکەوێتە ناوچەی (فریولی) یەوە.
٥ - ٦ -(Trieste ـ ترییستێ)، ( Udine ـ ئودینێ ) دوشاری ئیتالین، دەکەونە سەرووی ڕۆژهەلاتی ئیتالیاوە.
٧ - (باوەشی شووشە ) مەبەست لەو سندوقەیە کە مردووی تێ دەخرێت و ڕووەکەی شووشەیە بۆ ئەوەی مردووەکە ببینرێت.
٨ - (کات) یان (زەمەن) بەرامبەر بە ووشەی (Tempo) ی ئیتالی بەکارم هێناوە. شاعیر مەبەستی لەم کاتە سەردەمی لاوێتی و جوانی کرێکارانە کە لەتاو کارگەدا بەسەری دەبەن و خاوەنەکانیش نرخی ئەمە نازانن.
٩ - بۆ ئەم زانیارانەی کە پەراوێزەکانم لەبەر ڕۆشنایی دا نووسیووە، دیسانەوە بڕوانە ـ ئینسیکلۆپیای گەورە ـ Grande Enciclopedia — دەزگای جوغرافی « دێ ئەگۆستینی ـ De Agostini » شاری (نۆفارا) ساڵی ١٩٨٣..

# بوێکا مه باران دڤێت

محمد سلیم سواری

تێشتەگەهیو... بەلێ تێشتەگ هەکا درەنگ بو، دەمێ رێبەر لسەر تێشتێ رابوی، وخو ئەماندیە نك کلابکێ جلکێت وی یێڤە... بلەز دەست دا قەدەك و ئێشلەکێ خو، کرنە بەرخو... شەپکێ خو ژی کرە بەرخو... بلەز شویتکا خو گرێدا... شەلێ خو ژی کرە پێ خو... پشتی کولاڤ دەرسوکێت خو کرینە سەرێ خو... بەزی کالگ و گورە کرنە پێت خو... پشتی دەلنگێت شەلێ خو د بەر ساقێ را پێچاین... گوپال ل دەرگەهی ڤەکرو د دەستێ خو گرت، بەری دورکا دەرگەهی بگرت دا ڤەکەت... بابێ وی گوتێ:ـ

ـ کوڕێ من چ خێرە؟ تە خو هوسا پێچای... یێ تە ببینت، دێ بێژت هەوارەکا لدویڤ وبەزی وی یێ برپێ، ودێ دویڤ چت.

ـ باب... خوری بەس پەز برپبینبا... پەزبرپین ژی یا وەسا نینە.

ـ ئەو چەوا؟

ـ باب.. ئەو دەراڤێ... نوکە ئەم تێدا ژ برپبینا پەزی مەسترە.

بابێ پارێ نانی د دەستێ خو داگرت... بەری بکەتە د دەڤێ خو دا، ما دناڤ چاڤێت کوڕێ خو

نێری... چو ئاخفتن ژێ نه هاتن.. بەلی وی بخو زانی، کو کوڕی وی ڕاست دبێژت، هێدی بەرێ خو ژ فەرخەسێنیا خارنێ ڤەکر... پشتی پارییێ خو د دەستێ نەڤیێ خورا کری.

لگەل ڕێبەری... وەسا بابێ خو دیتی، زانی کو وی برینێت بابێ خو ڤەکولان... وگەلەک بیرهاتن ئینانه بیرێ، گوپالێ خو دابن کەفشێ خو... دەرگەهـ ڤەکر، پشتی پیچەک خـو چەمـاندی... ژ مـال دەرگەت... بەرێ خو دا کولانێ، بەرێ وی ڤ هندەک بچویکا کەت... لبن بەربانگێ وان یاری د کرن، مادوان فوکری... هزروبیرا هێلینا خو دسەری دا چێکر... پەزێ وی هاتە بیرێ... چەوا هەکە باران نەهێن.. دێ ژ برسادا مرت... دهەکا چلیێ وان بتنێ یا مای... هندە ئەوژی دێ خلاس بیت... چوسالا ئەڤ تشتە نە بیە، هندە هەیڤا ئاداری ژی بنیڤی بو... هێش باران نە هاتینە... گەلەک سالا وەک ڤی دەمی، تژی کولانێت گوندی بەفربو... لسەر تلخێت بەفرێ، ئەم دچونە سەربانا... ئەڤە هەیڤا ئاداری ژی یە، هێش باران نە بارینە... دیارە ئەڤە ژی خفسا خودێ یە... ئەوی زانی کو گەلەک سالا باران کێم دهاتن... بەلێ تا ئاڤا، کانیا وان ژی هندە کێم نە دبو... لدویڤ وان هزروبیرا... ڕێبەر نگەل خو بئاخفتن هات:ــ

(شڤێدی بت... بتا دەیکا من بو، هەکو کابانیا من ئامان د شویشتن دکوتێ (بەرێ تە ل ئاڤێ بت، ئاڤا کانیێ تەمەت ئویلیکا مەسینی یە، دانەکێ ڕوژێ... مروڤ دێ ل گەرێ ڕاوەستت.. تا کونکە کێ ئاڤێ دئینت)... ڕاست دبێژت چوسالا کانیا مە هولێ نە هـاتیە... ئـەڤساله سـالەکا کـرێتە... هـەمابێهن قەموتگ... یاژ دونیایێ دچیت ».

ڕێبەر پێ.. پێ لسەر پەیسکێ خارکەت، کوڕێ وی یێ بچویك... هێش پارییێ وی د دەستی داچو، لدویڤ بابێ خورا کرە غارو گازیکر:ــ

ـ باب... ئەژی دێ لگەل تە هێم.

ڕێبەری گوپال ژ بن کەفشێ خو ئینا دەرێ و بەرسڤا وی دا:ــ

ـ کوڕێ من... ئەڤە هەڤالێت تەنە... لگەل وان بو خو یاریا بکە.

ئێک ژ وان بچویکا... هەکو گول وێ ئاخفتنێ بوی گوت:ــ

ـ مام.. چ یاری بکەین ؟

ڕێبەر ما دوان و کوڕێ خو نێری... گەلەک تشت هاتنە بیرێ... هەکو بچویک... دەمێ باران نە دهاتن... دا هەمی بچویکێت گوندی دویڤ ئێک کەڤن و هەلامەتەکی ب سەرێ دارەکێ دوگاز دانن، ودا ل کولانێت گوندی زفرن و ب دەنگەکێ بلند... گازی کەن (بـویکا مـە باران دڤێت)... هـەر مالەکـا گەهشتیانە بەردەری، دا کابانیا مالێ ترارەکێ ئاڤێ ب سەرێ وان دا کەت... پاشی دا هندەک مێویژا.. قەسپا.. هژیرا.. هندەک شەکروکا دەتێ، هەکو ئەو هزر هاتینە بیرێ، گازی بچویکا کر:ــ

ـ وەرن.. دا تشتەکی بو وە بێژم... چ یێ گوهێ خو بدەتە من، وبێژتە هەمی هـەڤالێت خـو، بچویکێت دی یێت گوندی... دێ شەکروکا دەمێ.

ل دویماهیا داخازا وی، هەمی بچویکا ب دەنگەکی بەرسڤا وی دا:ــ

- بەس تو شەکروکا بدەمە... تە چ دڤێت، دێ وە کەین.

ئینا رێبەری هێدیو ب دەنگەکێ نازک گوت:-

- ل پار بیرا وە تێت... من دڤێت وەک پار هەلامەتەکی بهەلگرن و بویکا بارانێ بێژت.

ئینا ئێک ژوان بچویکا ب دەنگەکێ بلند گوت:-

- مە نەڤێت باران بهێن... دێ بتە هەرێ و تەڤن... پاشی چەوا دێ بوخو یاریا کەین.

- گەلی بچویکا... وە نە بێژن... هەکە باران نە هێن، چو گیاو چاێ شین نابن، ودێ پەزێ مە مرت و کارک نا مینن... ما هوین حەژ کارکا نا کەن.

هەمیا ب دەنگەکی گوت:-

- بەلێ کارک د جوانن... ئەم گەلەک حەژ کارکا دکەین... هەکو مروڤ د چیتە بەر کارکا چەندا خوشە.

- ڤێجا بویکا بارانێ بێژن... دا شەکروکا بدەمە وە، ما هوین حەژ شەکروکا نا کەن ؟ شەکروک د خوشن.

هەمیا ب دەنگکی گوت:-

- بەلێ شەکروک دخوشن... ئەم هەمی گەلەک حەژ شەکروکا دکەین.

- دێ باشە... من چ گوتە وە، گوهێ خو بدەنە من.

ئێکسەر کورێ رێبەری گوتە بابێ خو:-

- باب... پار ب شەڤ مە بویکا بارانێ د گوت... چەوا ئەڤ سالە ب روژ بێژن.

- کورێ من... پار جارو بارا هندەک باران دهاتن، بەلێ ئەڤ سالە، هێش چو باران نە هاتینە، ڤێجا ئەڤ سالە دڤێت ب روژ بویکا بارانێ بێژن... دا باران بهێن و پلە، پلە بکەڤت !

هەکو بچویکا گول ئاخڤتنا رێبەری بوی... تێک هاتن و چون و دویڤ ئێک کەتن.

رێبەر ژی د کولانا گوندی دا چو خار... یا د دلی دا ئەوبو، لەکەل هندەک گوندیا، بچتە مالا ژن ماما مرو.. دا ب خوشی، یان ب نەخوشی رازی کەن... و وێ کێلیێ بکەتە د مەنجەلا ئاڤێ دا، تا باران بهێن... ێ ئەو دزانت، هەر سال هەکو د بو هەیڤا ئاداری، و هەکە باران نە هاتبانە... گەلەک ژ خەلکێ گوندی، دا چنە نک ژن ماما مرو.. دا کێلی کربا د ئاڤێ داو باران بارییانە.

لسەرێ کولانێ... رێبەری دیت... کول بن بەرسفکا خالەتا زەینەب وان... گێلەشوکا مروڤانە.. هندەک گاڤێت بلەزو فر هاڤێتن و خو نێزیکی وێرێ کر، ناڤێ دویپشکی و پێڤەدانێ... هاتەگوها.

جارەکا دی کەتە د هزرا بارانێ و هشکاتیا دونیایێ دا... باش هاتە بیرێ، کو هەرسال وەک ڤی دەمی چو دوپشک نەبون... بەلێ ژ کێم بارانێت ئەڤ سالە، هەما ئاخ وەک کون مشکا یا شەق شەق د

بیت و دوپیشکێت بەردبنەوارا...

ل دویما هیا وان هزرا، لگەل خو گۆت:ـ شڤێدی ژی دوپیشکا ب سێ چار گوندیا ڤەداماو دلێ وان هاتە گرتن و دو ژێ مرن... ئەڤە کوڕێ خالەتا زەینەب ژی هاتە سەر، هەکە ئەم د ڤان کاو دانا دا بن و باران هەر نەهێن.. ئەڤ دوپیشکەنە چو حالا بو مە نا هێلن».

سەرێ خو بلند کرو د عەسمانی فوکری، بەلکی پنیەکا عەڤری بهێتە پێش چاڤا، بەلێ ژ خۆبو، دویڤ دەنگێ خالەتا زەینەب، سەرێ خو بلندکرە ڤە... هاتە کوها کو یا دبێژت:ـ

ـ دێ وەرە رێبەر... دوپیشکی ب کوڕێ من ژی ڤە دا... بلا بێهنا وە هەمیا بهێت. رێبەری ب ئا خڤتنەکا ز ڤڕ گۆتێ:ـ

ـ بو چ بێهنا مە بهێت ؟ ما مە گۆتیە دوپیشگ ب کوڕێ تەو خەلکێ گوندی ڤەدەن.

ـ راستە وە... وە نەگۆتیە... بەلێ هەکە هوین زەلامبانە... دا چنە سەر خانییێ وێ پیرا سێرا... دا ئەو کێلی کربا د ئاڤێ دا.

پاشی خالەتا زەینەب ب دەنگەکێ نزمتر، هەر وەگ بۆ خو دبێژت گۆت: دێ دایێ ما من شولە پێ یە.. من خویکا خودا... دوپیشکی ب کوڕێ من ڤەدا... ما بو ئەز هندە د ئاخڤم، و یاپشتی گرانم ؟

هەکو بەرێ رێبەری ڤێکەتی... ب دەنگەکێ بلند گۆتێ:ـ

ـ وە نە بێژە.. هەکە باران نە بارن..ئەڤ دوپیشکەنە، دێ هاربن و دێ ب کوڕێ تە یێ دی ژی و گەلەگ خەلکێ گوندی ڤەدەت... دڤێت باران بهێن، دا ئەو دوپیشگ دوان شەق و کونجادا بخەندقن و ب کەسێ دی ڤە نە دەن.

چەوا رێبەری ئەو ئاخڤتن کرن... خو هاڤێت و چۆ... هەر وەگ تشتەك د سەری دا... هەکو ژوێ گێلە شوکێ دویر کەتی، سێ چار زەلام ب دویڤ کەتن، ل بەراهیا وان، وی ژی گەمیا گوپالێ خو گرت... ژ بێ دەنگیا وان... رێبەری زانی، ئەو ژی، وەگ وی... د عاجزو دل تەنگن، وبێهنا وان یا هاتیە سەرێ دفنێ... و ئەو تشتێ د سەرێ وی دا، یێ د سەرێ وان ژی دا... لسەرملێ خو زڤری و ب دەنگەکێ نەرم گۆت وان:ـ

ـ هوین دزانن... نوکە ئەم دێ کیڤە چن و چ کەین ؟ ئێگ ژ وان بەرسڤا وی دا:ـ

ـ ژ ئەو ئاخڤتنێت، خالەتا زەینەب لگەل تە کرین... ئەم دزانن... کا دێ کیڤە چن و چ کەین ؟

رێبەر ما د وان فوکری... ئاخڤتنێت خالەتا زەینەب هاتنە بیرێ و گازندێت وێ... کو کوڕێ وێ دوپیشکی یێ پێڤە دای، وهەکە ئەو زەلامبانە، داچنە سەر خانیبێ پیرێ... دڤیا ژ مێژ وەر بو... وان ئەو کار کربا... دوان بیرادا... رێبەر د هزرا وەربو « ئەڤە دەهـ روژە، کاروانێیت گوندی... کـارێ خو

کری... دا بچنه کاروانی... به لێ ژ بەر ئەو کاودانێت، گوند تێدا، ژ کێم چلی و ئالفێ دەوار و تەرشی و زێدەبینیا دویپشکا... رۆژ بۆ رۆژێ دەست و دلێت وان نا گرن، بچنه کاروانی و گوندی بهێلنه د ڤی سەروبەری دا... ئەوژی دحەڤن... نە چنه کاروانێ دەشتێ ؟ ؟! کی نا بێژت... هەر ئێگ ژ وان تا دچته کاروانی و د زڤرت، دێ چ قەومت ؟ دێ ل مال چ بینت ؟ پەزێ مری... گارەش و دەوار دنەساخن... دویپشکی ب کورێ وی یێ ڤەدای... ئەو هەمی سەخمەراتی وان، دێ چنه کاروانی، دا بارەکێ گەنمی... بارەکێ کایێ بینن، ما ئەو بارێ گەنمی بۆ چ یە ؟ هەکە ڤ عەیالێ وان را نە گەهت... ما ئەو بارێ کایێ بۆ چ یە ؟ هەکە ڤ دەوارارا نە گەهت... گەلەگ نە یا دجهێ خودایە، د ڤان کاودانادا مرۆڤ گوندی بهێلت... ئەوژی رەڤینەکە، نێ کاروانێ هەژی هەر ئەڤەیە... کێلیێ بکەنە دئاڤێدا.

هنگی رێبەری سەرێ خو بلند کرو گۆتە وان گوندیا:-

- گوندینۆ... وە دڤیا بێژمە وە... کا دێ کی ڤەچن ؟ هوین چێتر ژ من دزانن... ئەم دێ چنە مالا ژنماما مرۆ.. ب خوشی بت ؟ یان ب نەخوشی بت ؟ دڤێت وێ کێلیێ بکەنە د ئاڤێدا.

ئێکێ دی ژ وان زەلاما، لگەل رێبەری بئاخفتن هات و بێت دی گوهێ خودایێ:-

- برا رێبەر... مرۆێ هایش بارانێ و کێلێ نینە... مرۆ ب خوڤە یا مژویلە... یا لسەر کەراتێ.

- کەکو... بلا وێ ئەو کێلی کربا د ئاڤێ دا... بەلێ هێش لسەر خوو نە کەتیە د نڤینادا، و هولێ نە هاتیە هە.

- هێ.. هێ.. نێ وێ هندە گیروکر، وێ نە دڤیا باران بهێن... دا رێبار نەخوش نەبن و نە بنە تەڤن... یا ل هێڤیا کچا خو، دا سەرا وێ بدەت.

- وێ خوو کچا خو یا ل بەر...دێ گەلەگ باشە، بلا کچا وێ بهێت... نوکە مرۆ یا بێ چارەیە، نەشێت وێ کێلیێ بکەتە د ئاڤێدا..بلا کچاوێ بکەتە دئاڤێدا..مانێ تەسلیما وێ... بۆ کچا وێ دچت.

- نە برا نە... کچا وێ حەق نینە، وێ کێلیێ بکەتە د ئاڤێدا.. تەسلیم بۆ وێ نا کەڤت... چونکی ئەو ب کەسێ گوندێ خو رازی نەببو.. یا شوی ب بیانیا کری... نێ یا شوی ب بیانیا بکەت تەسلیما کێلیا گوندێ مە بۆ ناچت.

- ئەو چەوا ؟ !

- برا... تەسلیما کێلیێ هەر بۆ خەلکێ گوندی د کەڤیت... نە بۆ کچا وێ.. هەر ئەم گوندی دبنە وارسێت تەسلیما کێلیێ... کا هوین وەرن.. دا بچنە د ژۆرڤە... خو گیرو نە کەن !

لگەل هندێ رێبەری و برادەرێت خو، خو هاڤێتن و چونە دا مالا پیرە ژنێ ڤە... ئەوی دیت... کوسی پیرە ژن... بێت ل رەخێت وێ کومبین، و هێی بێت روندکێت خو ڤەد مالن... و مێزەرگ ب سەر تەرمێ پیرێرا یا راکێشای...

پێ.. پێ... وبێ دەنگ ژێبەریێو هەڤالێت خو... قەستا ستێرکی کرنو ب رەخ ڤە... رێبەری کێلی هەلگرت... ول دەرازینکا مالا پیرێ بەرێ ڤەبوو دەرکەتن... ل کولانێ دەنگێ بچویکێت گوندی هاتە گوهێت وان (بویکا مە باران دڤێت).

رێبەر ماو بەرێ خو دا قاما دەنگێ بچویکا لێ د هات... گرنژیو سەرێ خو بلندکرو د عەسمانی... نێری... دیت کو پنیێت عەڤری، ل عەسمانی بێت تێک چوین... دەمێ بەرێ خو ژ عەسمانی ڤەکری... دیت چار پیرە مێرا، مەرو قەزمێت وان، بێت لسەر ملاو بێت قەستا مناسبێ گوندی د کەن ! پاسی بەرێ خو دا هەڤالێت خوو گوتێ:ـ

ـ دێ... نوکە ڤێجا وەرن.. داڤێ کێلیێ بکەنە د کانیا گوندی دا.

ئینا هەڤالەکی بەرسڤا وی داو لگەل کەتە ئاخفتنێ:ـ

ـ پانێ پیرێ نە دکرە د کانیێ دا:

ـ نوکە دا بو وەبێژم کا ژبەر چ پیرێ ئەو کێلی هەر نە دکرە د کانیا گوندی دا... هەکە وە کربا، پاچەوا هەر گاف، خەلکێ گوندی دا دەستێ وێ ماچیکەن... دا ئەو کێلی کربا د مەنجەلا ئاڤێ داو داتاڤەکا بارانێ هاتبا... وەرن گوهێ خو بدەنە من... جهێ ڤێ کێلیێ کانیا گوندیە ئەوا چو جارا هشک ژی نابت.. و نە بەس دا تاڤەک بارانێ بهێت... بەلێ دا پلە بکەڤت.... دەرمانێ مەو ڤی هشکاتیێ هەر پلەیە !

ـ دێ هەما... هەر تو هەرە... کێلیێ بکە دکانیا گوندی دا... بو ڤی کاری کەس ژ تە فەرتر نینە.

ـ نێ ئەز وێ ئێکێ نا کەم... یا پیرێکری...وەرن ئەم هەمی پێکڤە... دێ کێلیێ کەنە دکانیێ دا... نێ پشتی پیرێ تەسلیما کێلیێ.. یا مە هەمی گوندیانە.. دانوکە وێڤە کەس بتنێ خو نە هەلاڤێت.

بەغدا ٢٥ / ٢ / ١٩٨٥

محمد سلیم سواری

O

# تەم

* غفور صالح عبدالله *

لە بەشێکی دەفتەری یاداشتنامەکەی قارەماندا ئەمە نووسراوە. بەڵام لە ڕووی زمانەوە هەندێ دەستی پێداهێنراوەو، دیارە بەپەلە نووسیوویەتیوە بۆیە خاڵو فاریزەی لە بیرچووە، یان برگەکان لەیەك جیابکاتەوە، لەمەودوواش سەرلەبەری یاداشتەکانی هەندێ دەستیان پێداهێنراوە، بۆئەوەی زێتر لە ڕووی زمانەوە پوختەبن.. دەشێ ئەم بەشەش پرۆژەی ڕۆمانێك بووبێو تەواو نەکراوە..

* *

چاو لە هەڵۆکە ناگوێزمەوەو نایترووکێنم، بەئاستەم بلەرێتەوە هەستی پێدەکەم. وەکو هەست بەخوێنی خۆم بکەم کە لەشادەمارەکانمدا پلدەداو، دەرژێتە نێو چوار بەشی دڵەوە. هەستێکەو دەمێکە لەگەڵیدا گۆشبووم، کە بچمە سەرترۆپکی گردۆڵکەیەك، یان چیایەك، ئەڵبەتە هەستێکی سۆفیانەشو هەرلە منداڵیەوە ئەم سروشتە فووی کردۆتە ڕۆحمەوە. بەدووربینی دیەکانم تەنها چاوم بڕیە هەڵۆکە. لەدوورەوە دەڵێی قۆزاخەیەکی لۆکەیەو لە دەوەنێك گیربووە. بەڵام لەچاوی مندا قەبارەی هەڵۆکەو خۆیانن.. سەرلەبەری هەر پێنج هەستمو، بگرە هەستی شەشەمیشم و ئەودیوی ئەم هەستانەش، بوونەتە باڵاگەردانو ئاوێزانی هەڵۆکە.. هەڵۆیەکی بەهارەو بەچەندان لێزمەی بارانو شەونم خۆی شیشتووە. بۆیە دەڵێی گونتکێ لۆکەیە ئەوەندە سپی دەچێتەوە، بەدەم کرنکی خورەکەشەوە بریقە بریقیتی.. پەڕی هەڵۆ نەرمو شلە، لەوانەیە دەستی پێدا بێنی وەکو دەست بەقژی کیژێکی بەنازەوە بێنی وابێ.. هەڵۆکەم بەوکیژە دانا کە بۆم نەبوو. ئەوکیژەی کە پێکەوە حەزمان لەدیتنی هەڵۆ بوو، هەچ ڕۆژێك هەرکامێکمان هەڵۆیەکی دیتبا، بەهەڵەداوان غارمان دەدوا، بەریدیمان دەوت، کە ئەمڕۆ هەڵۆیەکم دیوە ( ئای کە هەڵۆیەکی جوان بوو، چەند بە نازەوە لە ئاسماندا باڵەکانی فش کردبوونەوەو، لارە

لارەی دەکردو بەنەرمیەکەوە دەیقیڕاند.. ئەم دەمەونیوەڕۆیە، دیتم لەسەر ترۆپکی کێوەشینە بای باڵەکانی خۆی دەداو بەتەنیا لە نێچیر دەگەڕا )... شەوانێکی زۆریش خەومان بەهەڵۆوە دەدی‌و، بۆسبەینێ هەر بەیانی زوو سەربردەی هەڵۆی خەونەکەمان، بۆ یەکدی دەگێڕایەوە.. ئەو دەمەی منداڵ بووم باوکم لە دۆڵەکەی ئەودیوی دارەبەنەکەی بەرانبەرمدا، هەڵۆیەکی کوشت و لولاقەکانی کردە فیقنەو دووزەلە. من و ئەو کیژەش هەرکە هەواڵی کوشتنی هەڵۆکەمان بیست، شەو تا بەیان بەدزیوە لەداخی چارەنووسی هەڵۆکە شیوەن و گریانمان بوو.. دووزەلەکەش تا ئەم چەنانە وەکو دیاریەکی بەنرخی باوکم و بۆ یادی هەڵۆکە هەڵگرتبوو. ڕۆژێکیان لەگەڵ دەردیسەریەکەی ئەو ساڵەی خەڵکەکەدا، کەوتیتەسەر ساجی عەلی و دووزەلەکەشیان لەگەڵ خۆیاندا برد.. هەرکە دەنگ و باسی هەڵۆش لەم دەوروبەری بڕایەوە، کیژەکەش بەجێی هێشتم و، کەوتە تەك مل قەویەکی خواپێداو.. ئەمێستاش هەموو کوێرەوەریەکم لە منداڵی ئەو حەزەوە چەکەرەی کردوە، بۆیە گەلێ جار قینم لە هەموو کیژی ئەم دنیایە هەڵدەسێ.، ئای کە دەبێ پەڕەکانی هەڵۆ نەرم بن. چۆنە ئێستا بیکەمە ناوەخنی سەرینێك و، پێکەوە لەگەڵ ئەو کیژەدا بخەوم کە بۆم نەبوو؟. نا..نا.. چۆن دڵم دێت . !. هەڵۆ پیرۆزەکەیەو هەربەو یادەشەوە هەڵۆ لام بۆتە زینەوەریکی پیرۆز. ئێ با بەخەیاڵیش بێ هەر خۆشە.. خۆشترین ساتەوەختەکانی مرۆڤیش ئەو ساتانەیە، کە بەخەیاڵ بەسەریان دەبات.. ڕەنگبێ هەڵۆکەش وەکو من لە نێو لق و پۆپەکانی دارەبەنەکەدا، جێگای خۆی خۆش دەکا. بۆیە جار بە جار باڵەکانی ڕاست دەکاتەوەو جووتیان دەکا، هەندێ جاریش بەیەکیانەوە دەدات، یان تاق و فیق دەبنەوە. لارە لاریەتی، دڕ بە لق و پۆپەکان دێتە گوێم. چاوم لە هەڵۆکە کردو، فیش بەردێکی قۆقزم دۆزیەوەو ئانیشکم دادایە سەری، دارەبەنەکەش لەوبەری قەڵاکەوە، لەسەر یالێك وەکو پاسەوانێکی مێژوویی و دەستی لە ئاسمان پان کردبێتەوە وایە. بێباکانە لەگەڵ بووندا لەبەربەرەکانی دایە.
لەولای دارەبەنەکەشەوە چیایەکی دیە، چیایەکی لەدووڕا، لەنووکەوە چەند ترۆپکێکە و بەیەکەوە لکاون، لەم سەر بۆ ئەوسەر، ڕەوڵێی زەلامێکەو ڕاکشاوەو ڕووی دەمی لە ئاسمانە، بەواتایەکی دی لەسەر گازی پشت وەرکەوتتوە، لەم سەرەوە ترۆپکەکەی ددڵێی کەلەسەری زەلامە ڕاکشاوەکەیە، لە ناوەڕاستیشەوە وەکو ناوقەدی بەپشتوێن جەڕابێ وایە. ترۆپکەکەی پاییینیش پێیەکانی زەلامە هەلازاوەکەیە. لەدوورەوە لەپەیکەرێکی سوریالی دەچێ. لە ناوقەدی چیاکەشەوە، نیوە ترۆپکێکی دی خۆی پێوە مت کردوە، ئەویش لەدوورەوە وەکو کەلەسەری مرۆڤێك وایەو چاوەکانی قووچاندوە، بەرانبەر قەڵاکە دەمی ڕەشی دەبچڕاندوە. کونا ئەشکەوتێکە لەوەتەی ئەم بوونە هەیە، ئاوها زاری کردۆتەوە.

پڕ بە ناخ سۆزێکی ڕادەبەدەر دایگرتم، چاوم پڕ بوو لە فرمێسك، خۆزیام دەکرد بوونی منیش ڕەگەڵ بوونی ئەو ئەشکەوتە بووایە، چونکی ئەشکەوت تەنها لەچەند گاشەبەردو تەق تەقە تاوێری یەك لەسەر یەك، سروشت هەڵیچنیوە. گاشەبەردو تەق تەقە تاوێریش زمانی تایبەتی خۆی هەیە..

ڕۆژێکی بەهارە، یان ئەوەتا ڕۆژی هەر بەهارێکی دیش وابوو، دەشێ نزیکەی دوو سەد ساڵ، ئەو سەردەمەی کە پاشای ... بەبە ... ناوی ڕەوانە کردو، هەواڵی بارودۆخی میری ڕەواندزی دەپرسی. بڕۆ بۆ دەپشتی خۆت، بەر لە ئێستاش ئەم بەهارە هەر ڕوا... بووە. ئەم ناوە تا ئەژنۆ زەلامێك قەرسیل و سەوزەگیایە. ئەوە جگە لە گوڵەمێرۆی باڵەبەرزی ڕەنگاو ڕەنگ، جگە لە چاوبازەی بەبزوگەلای پان پانەوە، بەبە لالووکی گەلا سوورووری ئەمامو ... ڕەختی بەسالاچووی بەڕووەوە، بەکەزێی تازە چاوتروکاو و دەم پشکووتوەوە. جگە لەو ڕایەخە سەوزەی ئەو ناوەش، کە بەگوڵە بەیبوونی ئاڵ و وەنەوشەیی و مۆرو هەڵاڵە و گوڵاڵە سوورەوە، پەڵە پەڵە لێرەو لەوێ سروشت

بەدەستی رەنگینی خۆی رەنگی رشتووە. تابلۆکەیە لەو تابلۆیانەی کە لە ناخی مرۆدا ئومێدی ژیان دەروێنیّو،
هەست دەکا بۆ ئەو ساتەوەختانە خولقاوە، ئیدیش گوێ بەمردن نادات و لە دڵەراوکێی رەها دەکەن ـ دۆڵێکەو
مەگەر لە ئەفسانەکاندا هاتبێ! هەر لە ناوەراستی زستانەوە تا دەگاتە بارانبران. هەموو رۆژێکیش هەرکە گۆ
سوورەوەبووەکەی پانتایی گەردوون، لەسەر ترۆپکی قەڵاکەو دەم کەلی چیاکانەوە دەکەوێتە سەرەتاتکێ.
لەباکوورەوە تەمێکی چر وەکو هەرەسی رووبارێکی بەفری خاو، یان وەکو چوراوگەی قەد گاشەبەردێك، یان وەکو
گەواڵەیەکی درێژی دەم رەشەبا بەرەوخوار دادەکشێ، وەك بلێی سەراپا مێژووی ئەم ناوچەیە بەم دۆڵەدا
تێدەپەرێ... ئەو سەردەمەی لەشکری سوارەی حەمیدییش بەرەو قەڵاکە هێرشیان برد، هەر ئەم تەمە بوو
سەری لە لەشکرکە تێکداو، بەرەو دووا بۆوە.

رێگایان لێ تێك دەچوو، ئەسپەکانیان بەدەم کورژنەوە لە تەمەکە دەسەلمینەوە. چاو چاوی نەدەدی، بگرە
سەدان سواریش لەو هەڵەتانە دەگلان، بەرە بەرە لەشکری ئالی عوسمانیش دەیدا لە کەمیو، قەڵاکەش وەکو
بنیادەمێکی جوامێر لەسەر ترۆپکی یاڵەکە، دەستی دەنایە کورتە کەلەی خۆی و پێیان پێدەکەنیو ئاسوودە
دەبوو. هەواڵەکە دەگەیشتە بابولعالیو، لەوێشەوە نەرەیەك لە ئیستانەوە هەڵدەستا. فەرمان دەدرا، دەبێ
بەئاگریش بێ ئەو تەمە نەحلەتیە برەوێتەوە، کەچی بەهەزاران سوار بە مازووت و شاپلیتە ئاگریان دەکردەوە،
تەمەکەیش ئەوەندەی تر خۆی لێڵ دەکرد.. هەمدیس هەواڵ دەگەیشتەوە بابولعالی کە تەمەکە هەر نارەوێتەوەو
ئەرتەشی ئالی عوسمان قری تێدەکەوت. پەیتا پەیتا ئۆردوویان دەنارد. هەرکە دەگەیشتە دەمەو بەهاریش کورگە لی
قەڵاکەو، لە دەوروبەری شارەزووریشەوە ئابلووقەیان دەدان. ئەوەی کە تەمەکە تەواوی نەکردبوو، ئەوان
ئەنجامیان دەدا.. دۆڵێکە و مێژووی ئەم دەوروبەرەی پێدا تێدەپەرێ. هەرکە تەمەکە دادەکشێ و زگ لەزەوی
دەنێ، لەپرێکا بەدۆڵ و شیوەکانی ئەو بەرو ئەوەبەر پەل پەل دەبێتەوە. هەر ئەوەندەی یەك دوو جار چاو
بتروکێنی، وەختێکت زانی دۆڵەکە بۆتە درەختێکی سەرومر کەسکی وەرکەوتوو.

تەمەکەش رەویوەتەوە. یان دەشبێ تا دەگاتە دەشتی هەریرو بەری رەواندزیش و، لەوێشەوا بەرەو
هەڵگورد هەڵکشێ و، ببێتە هەورێکی رەش و بیکاتە لێزمەی بارانێك. ئەو خەڵکەش کە لەمدیو ئەودیوی دۆڵەکە بن،
تەمەکەیان بەرچاو ناکەوێ.. هەر ئەوەندەی یەك دوو جاریش چاو بتروکێنی هەمدیس تەمەکە دۆڵەکەی
تەنیوە... ئەو دەمەی کە چاوم هەڵبری و سەفین بە ئاستەم ترۆپکەکەی لەگەڵ جۆری جوولانەوەکەمدا کەوتبوە
سەرەتاتکێ.. بەفری سەر ترۆپکەکەیشی بە تەمە داچوراوەکەی دۆڵەکە دەچوو، سپی و تەنك و پەڵە پەڵە لە چەند
لایەکەوە رەش داگەرابوو، هەرکە لەپرێکا چاوم هەڵبری، نەمزانی ئەو هەڵۆیە لە چ ئاقارێکەوە پەیدا ببوو، لەسەر
خاف و پۆپەکانی داربەنەکە نیشتەوەو، نەشمزانی نێرەیە یان مێیە. لەوانەیە راوچیەکی سەردەرکەر هەر لە
دوورەوە رەگەزەکەی ئاشکرا بکا. ئەوەندەش شارەزا نیم... گاشەبەردو تەقتەقە تاوێریش زمانی نییەو کەرو
لاڵە، تا وەکو بنیادەمێك مێژووی سەرلەبەری بوونی ئەم دەوروبەرەم بۆ بگێرێتەوە.
هەستمکرد ئەمێستاش کۆمەڵە بنیادەمێکی رووت و رەجاڵ، هەر لە سەردەمی چاخە بەردینەکانەوە،
ژیانێکی ئاسایی لەوێ دەگوزەرێن، دەخۆن و دەست رەنگینی خۆیان دەنوێنن و، لەگەڵ مێینەکاندا جووت دەبن.
هەرکە شەویشیان لێهات لە ئەشکەوت دێنەدەرێ و بۆ دابینکردنی خۆراك و پۆشاکی رۆژی دوایی
خێزانەکانیان، دەکەونە راوە سووچەرو بەرازەکێوی و ژیژەك.. ئەگەر لە دوورەوە چاو هەڵبری تارمایی سەیر

سەیر لە کونا ئەشکەوتەکەوە سەرەتاتکێیانە، ملەقووڕتێ دەکەن. لەوانەشە چاوت ڕیشکەو پێشکە بکاو دیمەنەکە درۆ بێ !.. ترسم لێنیشت، وەلێ کە بیرم چوو بەلای بنیادەمە ڕووتو ڕەجاڵەکانی چاخە بەردینەکانی نێو ئەوشکەوتەکە، ترسەکەم ڕەوییەوە. ئەم دەورو بەرەش ئەوەندە کپە بۆیە هێدی هێدی گوێم لە قیرە قیری هەڵۆکەیە قیرەیەک مەگەر مرۆیەکی پێکراو ئاوها قیرەی لێهەڵسێ.

قیرەیەک بۆنی تەنیایەکی خەستی لێدێت. بۆیە ئەمجارە ڕووم کردە دارەبەنەکەو، شانی چەپم دادایە سەر بەردە قۆمزەکە. لەو دوورەوە چاوم بڕیە جووڵەو بزووتی هەڵۆکە. هەستمکرد وەکو بەردێک تووڕدەیتە گۆمێکی مەنگەوە، ئاوها ئارامیەک بە نێو هەناوم بەربۆوە. ئەو ئارامیە بوو کە ترسی تەنیایەکەی ڕەواندمەوە.. وابێ لە دەمە دەمی سالانی بڕانەوەی سەدەی بیستەمدا، هێشتاکە وەک شوانێکی دەرکراو، لانەوازو بێئەنوا هەڵتروشکاووم، دەڕوانمە هەڵۆکەم. منیش حەزم لێبوو وەکو باوکم هەڵۆکە ڕاوەکەم، لوولاقەکانی بکەمە دووزەلە.

وەلێ دەنگی قیرەکەی پەژیوانی کردمەوەو، ویستم تفێکیش لە خۆم بکەم.. بۆیە تەنها بە زەردەخەنەیەکەوە چاوم تێیبڕی. ڕۆژانێکیش بوو ئەم دۆلە بەبەر ڕێبوارو کاروانچی تا درەنگە شەوێکیش، بەتایبەتی ئەو شەوانەی کە مانگەشەو بووایە، ناڵەی دەهات. دۆلەکە بەسەنتە زەلامی سەعاتە ڕێیکە، بەلام ڕۆژانی بەهار دەبڕیە سەعاتو نیوێک ڕێگا، چونکە ڕێبوارو کاروانچیەکان تەڕبوشی ی بەهارەکە دەچووە ژێر کلێشەیانەوەو فریوی دەدان.. لەکوێ بووایە لایان‌دەداو بارگەیان لێ دەخستو، سووکە سەیرانێکیان سازدەدا. کەتیرە ڕەشو زووخالاویەکیان دەردێنا، بەچیلکەو پەلۆشەو خەڕنووکی ووشکەوە بوو، ئاگریان دەکردەوەو چایان دەمدەدا.. ئیدی هەرکەسەو توێشەبەرەی خۆی دەردێناو ڕایدەخست.

سەلکە پیوازێ یان چەند قلە گوێزێکیان دەردەهێناو، بەدەم قسەی ئەستەقو باسی کاروبار ڕاپەڕاندنەوە سووکە نیوەڕۆژەیەکیان دەکرد.

لەپاشانیش ئەوی جگەرەکێش بووایە، جاخە توتنەکەی و بەرماغێکی دەروێناو جگەرەیەکی دەپێچایەوە لەپاشان یەک دوو چایان بەسەردا دەکرد، مەکە ئیدی پاتشا خۆیان بوون ( دەی کوڕینە باناوی خوای لێ بێنین ). پێلوەکانم بوونەتە چوارچێوەی تابلۆکەی ئەم دەوروبەرە. هەڵۆکەش ئەڵبەتە گزنگەکانی خۆرەکە چاوی سەغڵەت دەکەن. بەرەو لای من ڕووی‌خۆی وەرگێڕا. هەمدیس دەستی کردەوە بەقیرە قیرە پڕ تەنیایەکەی خۆی. هەرکە ڕێڕەوی بایەکە بەرەولای من بووایە، تەنانەت گوێم لە تەقە تەقی دەنووکیشی دەبوو، جووڵەم لە خۆم بڕیوە، نەبا هەرکە جوولامەوەو چاوی لێم بێ و بەڕاوچیم تێبگاو، لەم دەوروبەرەدا بەتەنیا بەجێم بێلێ. چوار دەوری خۆم و هەڵۆکەشم تا چاو هەتەر دەکا، قەرەی قەرە ئاسایی لێنییە، بڕۆ بۆ چەند سەعاتە ڕێیک ئەولاتریش. نیگام ئاراستەی دارەبەنەکە کردەوە، گۆسوورەوە بووەکەی ئاسمانی گەردوونیش، لەئاقاری تێڕووانینمەوە بە هێڵێکی ڕاستەو ڕاست، بالا زەلامێک دەبێو نابێ بەرزبۆتەوە، کەڕنەقاڵێکی ڕەنگاو ڕەنگی بەهار بەدەم هێڵی گزانگەکانەوە، سەمایەکی ئەفسانەییان بۆ مێژوویەکی بێخاوەن سازداوە، سرتە سرتەی ئاسایی نایەت، جگە هەندەک جارکزە بایەک هەڵدەکاو، خشپەیەکی پڕ ئاوازی قەرسیلو کەسکە گیایەکەی ئەوناوە دەگاتە گوێم. یان لە دوورەوە بەدەم بایەکەوە کەروێشکە دەکەن. دەلێی بڕ بڕ کەروێشک بە چەند ڕیزێکی ڕێکو پێک و بەرەو دووای یەکەی گومەتە دەکەن... هەمدیس ناخم پڕ بوو لە قوڵپی گریانو، چاویشم پڕ بوو لە فرمێسک..

٣٩ ساڵە لەگەڵ ئەم دیمەنانەدا گۆشکرام، کەچی ئەمێستا بۆگەنی و دووکەڵی شاران سییەکانم دەخۆن..
پەیتا پەیتا هەڵۆکە بۆ تەنیایەکەی خۆی دەقیرینێ. لە کۆمەڵە چیاکەی بەرانبەردا دەنگ دەداتەوە، قەلاچوڵەکەش قیرەکەی دەسەنێتەوە، بەرەو ئاستێکی دی کێشی دەکاتەوە، هەستم کرد دەنگەکە سەرپاکی ئەم دەوروبەرە دەتەنێ.. دووای ئەوەی کون وکەلێنی یەکە بە یەکەی قەلاکە دەتاکێنێتەوە، خۆی بەژوورەکەی میردا دەکا، ژوورە گەورەکەی میر هێشتا شوێنەواری سەکۆی میرنشینیەکەی ماوە، سەرلەبەر کوناو ورد و درشت دایبێژاوە، مۆرانەو مارمێلکەو بزن مژۆکی هەمەچێژە، لەم لاو لەو لاوە سەرەتاتکێیانە، گوێ قولاغی دەنگەکە دەبن، کوڵەکەی ناوەڕاست ژوورەکەش هەروەکو دوو سەد ساڵ لەمەوبەر، وەکو خۆی ماوەتەوە، جگە ئەوە نەبێ بەچوار دەوروەدا مۆرانەو مرەو هۆی دیش هەڵیانکوڵیوە. دە پشت بەر لەئێستا برۆ پتریش، ئێوارەیەکیان قاسیدێک بەهەناسکە هەناسک، دووای ئەوەی پیاوانی میر دەزانن کێ یەو لەکوێوە هاتووە، ڕێگای دەدەن. خۆی دەکاتە ژوورەوەو لەبەردەم میردا دەست دەخاتە سەرسنگو دادێتەوە: ـ
ـ میرم، ئێوارەتان باش..

میریش وەکو هەڵۆیەک لەسەر سەکۆی میرنشینەکەی قیت ڕۆنیشتووە، بەدەستی ڕاستی پشتوێنە کریمسەتانەکەی لە ناوقەدەوە گوشیوە، لەسەرو چاوی‌دا دیارە هەندێ نارەحەتی و سەغڵەتی لە دەروونی‌دا وەنەوز دەکا، وەک بڵێی پێشبینی کارەساتێکی کردبێ، یان هەواڵی ئەرتەشی ئالی عوسمان و ڕووژاندبی و دەهری کردبێ.. وەڵی لەسەرەخۆ چاو دەبڕێتە چاوی قاسیدەکەو، بەدەم و دوویەکی هێمنەوە پێی دەڵێ:
ـ ها، کوردە، چ خێرە وەها پەشۆکاوی ؟ گوێی مەدەیێ، ئەگەر هەرچەندەش هەواڵەکەت ناخۆش بێ و مووژدە نەبێ، ئێمە هەرگیز نییە خۆمان وەها بپەشۆکێنین... دەی قەیناکە پێم بڵێ شیوت کردوە ؟.

قاسیدەکە بەشەرم و شەڵەژاویەوە وەرامی میر دەداتەوە:
ـ میرم، سەری ئێوە خۆشبێ چ بەدکاری ڕوونادات، تەنها میری ئێمەش بەهەواڵی وەزعی ئێوە سەغڵەتە، بۆیە نامەیەکی دۆستانەی ئەوم بۆ هێناوی.. خەمیشت نەبێ کوڕگەلی قەلا بەچاکی بەپیرمەوە هاتن و گەلێک ڕێزیان لێنام.
میریش بزەیەکی هاتێ و گوتی:
ـ کوردە، خۆ تۆ غەریب نییت. ئێوەش برای دڵ و بابی کوڕگەلی قەلاکەن..

میر بەفیزێکی دەسەلاتدارانەوە هەڵستایە سەرپێ و دەستێکی باخەنجەرە دەبانەکەیەوە هێنا، بەبزەیەکی دۆستانە ئاغرەوە، چاوی بڕیە قاسیدەکەو نامەکەی لێوەرگرت. نامەکەش لەسەر پێستی کەلەکێوی نووسرابوو، لوول‌دراوەو کەوانەیەکشی لە داربەڕووەوە بۆ دروست کرابوو، نامەیەکەی تێدا ئاخێنرابوو، میر نامەکەی لە کەوانەکە دەرێناو، پێستەکە بڵاودەکاتەوە دەیداتە بەر ڕوشنایی بەکێت لە شاپلیتەکانی ژوورەکەی، دەیخوێنێتەوە. لەپشان ئۆخژنییەک هەڵدەکێشێ و پێستەکە کەلەکێویەکە لوول‌دەداو دەیداتە دەست پاشیاوەرەکەی، داواش لە قاسید دەکا بێنە بەرەوەر. ئەویش لە میر نزیک‌دەبێتەوە، بە بەرزەفەریەوە دەستی بەسەرشانی‌دا دەداو، بەبزەیەکی جوامێرانەوە پێی دەڵێ:

- بەمیری « بەبە » راگەیەنە، کە ئالی عوسمان وەکو چەقەڵ کلکی دووڕی گەلی خۆی ناوەو! قەلاش سەپ و ساغە.. بڵێ بەبەڕێزیان ئەگەر دەم ڕووتەکڵنی شای سەفەوی بەقەرەی دا هـاتن خەڵکی قـەلاو ڕەواندزیش لە ئۆغریانە.. کوردە نەکەی زوویش بڕۆی تا بەچاکی وەرامی نامە دەدەمەوە لەگەڵ خۆتی‌دا ببە -

قاسیدەکە هەمدیس دەست دەخاتە سەرسنگی و دادێتەوە:

- بەلێ میرم، خودا بۆ ئێمەتان بێڵێ و فەرمانتان بەجێیە..

دەنگی قیڕەی هەلۆکە سەرلەبـەری ژوورەکە دەتـاکێنێتەوە، بـەرەو یەکـە بە یـەکەی ژوورەکـانی‌دی دەردەخرتی.. ژووری سەرکردەکان، ژووری پاسەوان و قاسیدەکان، ژووری جبەخانەکـە، گەووڕی ئـەسپ و وڵاخەکان... تەرسی ئەسپەکانیش لەگەڵ زەوی گەووڕەکەدا ڕەق‌بووە، هێشتـا هەنـدێ لەو بۆنـە مێژوویـەی تەرسەکە ماوەو، لەگەڵ گەرمای هاوین‌دا هەڵم دەکا..

دەنگەکە لەوێشەوە بۆ ژوورە تەریکەکەی - وەستا ڕەجەب -، ئەویش هەندێ لەو مێخ و بزمارانەی کـە ئامێرەکانی دروست‌کردنی چەکی پێوە هەڵدەواسێن هێشتاکە دیارن. شوێنـەواریان بـەسەر دیـوارەکانـەوە چاپ‌بوون.. هەندێکیش لە پارچەو مارچە ئاسن و تەنەکەو قـەوانە کـۆن، لەزەوی ژوورەکەدا لەم‌لاو لەو لاوە سەریان دەردێناوە.. ( وەستا ڕەجەب ) کابرایەکی تەمەن لە پەنجا بەرەوژوورتر. ردێنێکی تۆپ و ماش و برنج، لەناوشانەوە هەندێ کۆماوەتەوە، خێرا خێرا بڕبەنێك لە نێودەستە زبرەکەی‌دا دێ و دەڕواو، پارچە ئاسن دەڕنێ و لووسی دەکا.

کۆمەڵێ شاگردو پیشەزان، شپرزەن و بەکارکردنەوە ملۆشن و هەرایەکە نەبێتەوە.. تەق و تۆقی ئاسن کوتین و لە بڕبەن‌دان. ژوورەکەی قانگ‌داوە، لەوێشەوە دەردەفرتێ و سەرپاکی ڕەواندزیش گوێی لەو تەق‌وتۆقە دەبێ و، بەدەم زەردەخەنەی دڵنیایەوە چاو دەبڕنە ئاستی قەلاکە ( بترەژم وەستا ڕەجەب، دەس و بردکە، ئالی عوسمان خۆیان لە بۆسە ناوەو ڕووزەردمان نەکەی )، سەربازو سەرکردەکانیش ئاگایان لە هیچ دەنگێك نییە، تەنها تەق و تۆقی ژوورەکەی وەستا ڕەجەب نەبێ. ئەوانیش زەردەخەنەیەکی دڵنیایی دەیانگرێ وچاو دەبڕنە ژوورەکەی وەستا.. وەستایش سەرهەڵنابڕێ و جار ناجارێ دەست بۆ یەکێ لە شاگردەکان درێژ دەکاو، بەپەلە داوای ئامێرێك دەکا. ئەوانیش دەست‌وبرد فریای دەکەون. تا دەگاتە دەمەونیوەڕۆیەك چـارەگێك جبـەخانـەکەی پـڕکردوە. دەسبەجێ دابەش دەکرێن، یەك دوو مەترەلۆز لەسەریەك دوو لووتکەی نزیك قەلاکە دادەبەستن، ( وەستـا ڕەجەب ) خۆی سەرپەرشتی دامەزراندیان دەکا.. میریش چاوەڕێی دەست‌ڕەنگینی وەستایە. ئەرتەشی ئالی عوسمان چاوەنۆڕی ڕەوینەوەی تەمەکەیە. سەرپـاکی خەڵکی ڕەوانـدزو دەوروبەریشی، دەنـگ‌وباسی وەستـا ڕەجەب لە دەمی یەکدی دەقۆزنەوە. ئەوەندە شپرزەو دڵەڕاوکێیانە، هەرکە ئیش و کارێکی خۆیان رادەپەڕێنن، ئەنجا دەکەونە سۆسەی دەنگ‌وباسی قەلاو ( وەستا ڕەجەب ).. لەپاشان هەرکە دەنگی قیڕەی هەلۆکە خۆی بەو ژوورەدا دەکا کە بۆ ( مەلای خەتی ) بۆ بەرنوێژکردنی سەرکردەو قاسیدە کان و، پیاوانی میر تایبەت بوو. لەسەر دیوارەکانی ئەم ژوورەش هێشتا شوێنەواری هەڵکۆڵینی هەندێ ئایەتی قورئانیان پێوە دیارن. ئەو گومەزەش کە کرابووە قیبلە، هێشتا هەندێ لە خشت و بەردەکەی پەرت و بڵاوی ژوورەکە بوون و، بن‌تەمەڵەکەی لەزەوییەوە

بنگستێ بەرز بۆتەوە.. ڕۆژێکیان لەکاتی ئابلووقەدانی قەڵاکە لەلایەن ئەرتەشی ئالی عوسمانەوە، مەلای خەتی ) چووە کن میر، میر ئەو ڕۆژە کەیفساز بوو کە زانی ( وەستا ڕەجەب ) مایەی خۆڕاگرتنی قەڵاو میرنشینەکەیەتی.. میر بەدەمو دوویەکی بەرزەفەڕەوە لە مەلای خەتی پرسی:

- ها.. مامۆستا... ئەتۆ دەربارەی ئەم وەزعە تازەیەی کە تێیداین وورەت چلۆنە ؟..

مەلا بەڕێزو هەندێ خەمباریشەوە بۆ میر دەستی خستە سەرسنگو گوتی:

- قوربان، ئالی عوسمان خەیاڵیان خاوە، ئەگەر بەو ڕێگا چەپەڵە فریومان بدەن..

میر لە قسەکەی مەلا هەندێ سەرسووڕماو بوو، و پرسی:

- مامۆستا چلۆن.. ؟

( مەلای خەتی ) دووای ئەوەی رووخسەتی دانشتنی لە میر خواستو لەسەر سەکۆکەی بەرانبەر میر ڕۆنیشتو گوتی:

- میرم.. نامەیان بۆ ڕەوانە کردیمە، گوایە خەڵکی بەوە فریوبدەم، کە گوایە ئەم بەرهەڵستیکردنەی میرنشینەکەمان دژی ئایینە.. بەڵام یاغنیشنو نازانن ئێمە هەڵوێستی ئاوها کاری تێنەکردوین.. بۆ نموونەش خۆڕاگرتنی خەڵکی قەڵای ئەمەم بەرانبەر بەم جۆرە پڕوپاگەندانە.. ئەوانە وادەزانن بەخۆیان سەروەسیەتی پەیامبەری خودان.. ئێمە خودا دەپەرستین نەك سوڵتانەکانی ( ئیستانە )، بڕواشمان بەوە هەیە مافی خۆمانە بەربەرەکانی زوڵمو ستەم بکەینو، بەرگری لە خاکی باو باپیرانمان بکەین...

میر لە خۆشیاندا قسەکەی پێیبڕی:

- دەم خۆش مامۆستا. پیاوی ئایین دەبێ وابێ، نەك مفتەخۆر بێ.. چەندان پیاوی ئاینیش لەپێناوی بەرگری لە خاکی باو باپیرانیان تیاچوونو، خوێنی خۆیان بەختکرد... بۆیە بڕیاردەدەم لە ئەمڕۆ بەدواوە ئەتۆ موفتی گشتی سەرلەبەری ئەم میرنشینەی...

هەرکە دەنگی هەڵۆکە لەو ژووروەش بەپێی ئاڵوگۆڕی سروشت، خۆی پێناگیرێ. لەناوەڕاستی حەوشە گەورەکەی قەڵاکەوە بەرەو کەشکەلانی ئاسمان دەردەفرتێ. لەوێوە بەدەم بایەکەوە، بەرەو هەیبە سوڵتان، لەپاشان باڵ بە باڵی لووتکە بە لووتکە بەرەو دەربەن بازیان، سەگرمەش خۆت بگرە واهات. وەکو تۆپێکی موگناتیزی دەنگەکە لەم کەل بۆ ئەو کەل هەڵبەزو دابەز دەکا. لە پڕێکا لەدەمکەلی گردۆڵکەکانی حەمرین بەراش پەراش دەبێ. وەکو مشتێ گەردی خۆڵ پەرتوبڵاو دەبێتەوە.. دیسان هەڵۆکە دەکەوێتەوە قیرە قیرە تەنیایە هەمیشەیەکەی خۆی.. هەندێ جاریکیش دەنگەکە ئەم لووتکە دەیداتە دەم ئەو لوتکەیدی.. ئەوەتا هەڵۆکەش ئارامی لێبڕاوە.. هەناوەکە وەڕێی کردوە، ڕەوە پاسارییەك دەوروگری دەدەنو شەڕی پێدەفرۆش، خۆی لێیان تێناگەیەنێ. ئەوەندەم زانی هەڵۆکە هەڵفڕیو ڕەوە پاسارییەکەش کەوتنە شوێنی. زەردەیەکم داتێو منیش بەرەو لووتکەیەکیدی ملی ڕێگام گرت.

* * *

١٩٨٩ کەرکووك

# براتییا روڤی و مار

سەگڤان یوسڤی  ژ تیپێن لایتینی وەرگێرایە

هەبوو تونەبوو جارەك ژ جاران، رەهمە ل دێ و باڤێن گـوهداران، خەین ژ جەندرمە و تەهسیلداران.

روڤییەكی پرر فەنەك هەبوو. بـفـەن و فووتـان، بدەك و دولابان كەس پێرا نە دچوو سەری.

روژەك ژ روژان، روڤی پرر برچی بوو بوو. ژ برچییان « قورە ـ قور » ژ زكێ وی دهات. رابوو بچولێ كەت و لخورانێ گەرییا. د خوەست كو هەیوانەكی ژ خوە بچووكتر و قەلستر نێچیر بكە و بخوە. لێ قسمەتێ وی دەرنەكەت. لڤی ئالی گەرییا، لوی ئالی چەرخی. تەوش بوو. تشتەكی كو پێ زكێ خوە تێر بكە پەیدا نەكر. هنگی برچی بوو بوو. و بەتلیبوو، ژ هێژ كەتبوو. بزور دمەشییا.

پاشێ لقەراخێ ریلەکی « خشتین » ەکێ بهیست، کێفا وی هات. گوت
قەی کەو ـ مەوەکە خوە دبنێ دەڤییێدا ڤەشارتییە. بڤێ هێڤییێ هێدی
دزیکا. بەر ب دەڤییێ مەشییا. لێ هێژ نەگیهابوو بەر دەڤییێ، هەو دیت کو
مارەکی رەش مینا قیر ژ ناڤا دەڤییێ دەرکەت. کو چاڤێ روڤی ب مار کەت
سەکنی. قاسەك لمار نهێری. پاشێ سلاڤ لێ دا:

« روژ باش براکێ مار.. تو بکودا دچی وەها ؟ » مار سەرێ خو
بلندکر، دەرزییا خوە لڤی ئالی و لوی ئالی هەژاند، پاشێ بەرسیڤ دا:

« روژ باش، براکێ روڤی.. ئەز برچی بووم و لخوارنێ دگەرم. »
« وەللە ئەز ژی لخوارنێ دگەرم. لێ من هەتا نوها تشتەکی
دەستێ خوە نەخستییە »

براکێ روڤی، کا ئەو و تو ببن دەستەبراك و ب هەڤرا لخوارن
بگەرن. ب ڤی ئاوایی ئەم دێ ژ هەڤرا ببن ئالیکاری و بکارت هێسانتر نێچ
بکن. »

روڤی فکری، دیت کو پەیڤا مار راستە. یەکی تەنێ نکارە پرر تشتا
بکە. لێ کو چەند کەس دەستێن خوە بدن هەڤدوو، دکارن گەلەك تشتان بکر
پەیڤا پێشییانە:
« پرر مێرانییێ بەتال دکە. »
روڤی ب ڤێ فکرێ پێشنییازا مار قەبوول کر. ب ڤی ئاوایی هەر
بوون دەستەبراك ب رێ کەتن، ب هەڤرا ل خوارنێ گەرییان.
ژ ئالیکیڤە دمەشییان، ژ ئالیکیڤە ژی ڤالا خوارنێ و نێچیرێ دکر
پرر چوون هندك چوون، هەو دیتن کو ریا وان راستێ چەمەکی هات
راوەستان و ل هەڤ نهێرین. پاشێ مار پرسی:
« ئەمێ نوها چ بکن براکێ روڤی ؟ »

رۆڤی وەها بەرسیڤ دا:

« دڤێ ئەم ئاڤژەنی بکن، دەرباسێ وی ئالی ببن و لوی جەبەرێ چێم لخوارنێ بکەرن. »

لێ مار نەدکاری ئاڤژەنی بکە. ستوویێ خوە خوارکر و چاڤێن لاڤاکار لرۆڤی نهێری:

« باشە، براکی رۆڤی.. لێ تو دزانی کو ئەز نکارم ئاڤژەنی بکم. »

پاشێ پەیڤا خوە وەها ئاژۆت:

« براکێ رۆڤی، گەلۆ تو دەستوور نادی کو ئەز بێم پشتا تە و تو من دەرباسێ چێم بکی ؟ »

رۆڤی داخوازا مار بێ شوار قەبوول کر:

« بەلێ چما نا.. ما ئەم نە دەستەبراکێن هەڤی.. فەرمو، وەرە پشتا من ! ... »

رۆڤی مەخەل کەت، مار چوو لسەر پشتا وی خوە کلۆر کر. پاشێ رۆڤی رابوو، دا ئاڤێ و دەست بئاڤژەنیێکر، بەر بوی جەبەری پێشڤە چوو.. تام هات چێم، هەو دیت کو مار دەست پێکر، خوە لگەوریيا وی پێچا. رۆڤی ترسا و پرسی:

« تو چ دکی، براکێ مار ؟ »

مار وەها بەرسیڤ دا:

« ئەز دکم تە گەز بکم، براکێ رۆڤی. »

رۆڤی ژ ڤێ پەیڤا مار شاشبوو، ترسا وی ژی زێدەتربوو:

« چاوا تو ڤێ بێبەختییێ بمنرا دکی!.. نە ئەم بوون دەستەبراك.. ما تە ژ بیرکر !... »

« نە من ژ بیر نەکرییە... لێ تو ژ بیر دکی کو ئەز مارم. ئەرێ، ئەزبووم دەستەبراکێ تە. لێ بەلێ دیسا ژی ئەز مارەك ژ مارانم و خوییێ من ئەوە کو ئەز کەسێن دن گەز بکم. »

رۆڤی دەست ب لاڤان کر:

« ئەمان یەمان، براکێ مار وسامە ! .. تو زاراەکا من گیهایە تە بسەردا ژی من تو کری پشتا خوەکو ئەز تە ژ ئاڤێ دەرباس بکەم ما هەڤێ ڤێ قەنجییا من ئەڤە.. »

لێ دلێ مار بڤان لاڤان نەرم نەبوو. خوییێ وی یێ ماریتییێ جارەك ئەو گرتبوو. نەدکاری دەڤ ژ وی خوییێ خوە بەردە. روڤی ئیجار دەست بشیرەتان کر:

« بنێرە، براکێ مار.. کو تو من گەز بکی، ئەرێ، ئەزێ بمرم.. لێ تو دێ دئاڤێدا بفەتسی.. ما تو دکی ببی سەبەبێ مرنا خوە ژی !... »

لێ شیرەتان ژی تو کارەکی لمار نەکر. وی جارەك بریارا خوە دابوو کو روڤی گەز بکە، و کەیسا وی ژی نوها لێ هاتبوو. ئێدی ژ وێ بریارێ نەدژڤری. وەها گۆت:

« چ دبە بلا ببە، ئەز مارم و دڤێ ئەز وەك مارەکی تەڤکەرم. کارێ ماران ژی گەزکرنە. »

روڤی ئێدی هێڤییا خوە برری. زانی کو دەستەبراکییا مار پووچە وی ژی دەست بروڤیتییا خوە کر. وەها گۆتە مار:

« دەباشە براکێ مار.. مادەم تە بریارا خوە دایە، تو دێ من گەزبکی لێ ئەز دیسا ژی ل سەر دەستەبراکییا خوەمە. ئەزێ هەتا مرنێ ژی لسەر سوزێ خوە بمینم. لێ داخوازەکا من ژتە هەیە. هنگی ئەز تە دئەڤینم، مز دڤێ ئەز بەری مرنا خوە خاتر ژ تە بخوازم. »

مار پرسی:

« چاوا ؟ »

روڤی ب روڤیتییا خوە وەها بەرسیڤ دایێ:

« کێڤا من پرر ژ گەوریياتە یا خوەشك را تێ. من دڤێ ئەز گەوریياتە ماچ کم، بڤیئاوایی خاتر ژ تە بخوازم. پاشێ ژ خوە تو دێ من گەز بکی ئەزێ بمرم. »

مار داخوازا روڤی قەبوول کر و گەوریيا خوە بەر بدەڤێ وی درێ

کر. روڤی هەما ژ نشکاڤە ب بنێ چەنا مار گرت، گەز کر و دهەتا هێزا وی هەبوو شداند. مار خوە ڤردا ئاڤیت، وردا ل‌با خست، تەوش‌بوو. نەدکاری خوە ژ دەڤێ روڤی رزگار بکە. هێدی هێدی تەڤگرێن وی ژی سست بوون.

پاشێ روڤی گیها وی جەبەرێ چێم. ژ ئاڤێ دەرکەت.

مار ژ ستوویێ خوە ئاڤێت سەر سیلکێ. مار مربوو ژی. روڤی قاسەك لێ نهێری. باشێ وەها گوت:

« براتی خوەشە راستا ـ راست، نە وەها ب فەتل و فتوول. »

« پەیڤێن گران »

فەن: فێل

فوتان: سەردابرن

دوڵاب: چێکرنا رێکان ژبو سەرکەتنێ و پێشقەبرنێ « خطة »

برچی: برسی

قەلس: لاواز

چەرخی: زڤری، سورا

مەشین: چون، رویشتن

بهیست: گوهـ لێبو، گێ لێبو

ب‌کودا: کیڤە، کێوە

هیسانتر: ساناهیتر، ئاسانتر

چەم: بەر لیێڤێن روباران کو خیز و لم لێ‌بت

ئاڤژەنی: مەلەڤانی

کلوڕ: بادای

کەیس: دەلیڤە

چەن: ئەرزینك، چەنە

○

# هەڵوێست

١٩٨٦

فەوزییە عیزەدین ڕەشید

که چاوت پێ‌کەوت باوەڕت نەدەهات مرۆڤ بە چوار ساڵ ئەوەندە بگۆڕێ. بۆ پیربوونیش بوایە هەر نەئێستە بەڵام پاش چوار ساڵ، دە ساڵ گەنج بێتەوە ئەوەت زۆر لە لاسەیربـوو ونەئەچووە ئەقڵەوە.

هەقت بوو. ئێوە چوار ساڵ لە کۆلیجی ئەنداز بیاری‌دا پێکەوە بوون، تۆ ئەوت هەر بەو دەستە جلە چرچ ولۆچەوە دەبینی کە دەتوت پێوەی لە دایك بووە و ڕۆژ بە ڕۆژ لە گەڵیا گەورە بووە وا دەقی پێوە گرتبوو. هەموو جارێ لە دڵی خۆت‌دا دەتوت « ڕەنگە پێیانەوە بنوێ دەنا هەر دایکە ندبا لە بەری کردبایەتەو شتێکی لێ دەگۆڕا ». هاوڕێکانی دیکەتان بۆ بەزم دەیان وت ( وەلی دێوانەی هاوچەرخەو... دەیەوێ بەو بەرگەوە حەشر بکرێ ) تۆش زۆرت پێ ناخۆش دەبوو.

ئێستەش چڕ وچاو تێکچوو. سەر دانە هێنراو. کۆزەر ڕیش. شەپرزە. مەگەر خواش حەرکا دەنا یەك، دوو کتێبی بەر باخەڵیشی لە گیرفان‌دا بوو. ئاگای لە وردو درشتی نێوان هەر دوو دەوڵەتە گەورەکە بوو قسەی نەدەکرد تا باس دەهاتە سەر باسی خوارووی ڕۆژ هەڵاتی ئاسیاو برسی یەکانی ئەفریکا و ئەمەریکای لاتین ئەوسا ئیتـر نۆرەی بـە کەس نـەدەدا. کە

باسەکەش بگۆڕایە هەڵدەستاو دەڕۆیشت بۆیە تۆش هەرگیز قسەت پێ نەدەبڕی.

سەرسوڕمانەکەت هەر چاوترووکانێکی برد و نەبرد. بە حوکمی ئەوەی کە ئافرەتی گورج لە مەسەلەی گرنگی جلو بەرگ و دەس بە خۆداهێنان گەیشتی. کەچی هەر دوو دڵ بووی. خۆیەتی خۆی نییە ؟ !. تا دوور بوو باشتر دەتوانی تەماشای بکەی، بەڵام دوور بوو، کە نزیک تریش بووەوە دەبوو ئەوجا بە دزە نیگا تەماشای بکەی، دزە نیگاش دوو دڵی ساغ ناکاتەوە، حەزت دەکرد چاو ببڕیتە چاوی وبەکاوەخو سەرنجی بدەیت، بەڵام کوا ئەمە بۆ ئافرەتێکی لای خۆمان بەبێ گێچەڵ بە سەر دەچێ ؟ !.

ویستت خۆت بە دایکتەوە بخلافێنی و تەماشای نەکەیت، بۆت نەکرا، دەنگی پێی لە مێشکتدا وەك دەهۆڵ دەنگی دەدایەوە، هەتا دەهاتیش نزیکتر دەبووەوە، سەر ئەنجام قیروسیات لێ کردو لە دڵی خۆتا وتت « گەورە کچ بەمەش هیچی لێ نایەت » و وردە وردە چاوت هەڵبڕی. سەرەتا هەر پێڵاوەکانیت لێوە دیار بوو ئەمجا سەر ووتر و سەرووتر، تا چاوت بڕییە نێو چاوی، سەیرت کرد بزە گرتویەتی. بەمەش دڵت ئاوی نەخواردەوە، ناهەقت نەبوو، ئا ئاوا تەماشای هەر پیاوێکت کردبێ ـ ناسیاو ونەناس ـ هەر هیچی دیکەی لە دەست نەهاتبێ ئەوجا بزەیەکی ئاوای داوە بە ڕووتا. پیاوان هەمیشە و بۆهەمــوو ئافــرەتێك بــزەیەکی ئــاوا حازر بەدەستیان پێیە و پێویست بکا و نەکا، هەلیان بۆ هەڵکەوێت دەیدەن بە ڕوویان دا.

تا تۆ ئەم کێشانە و پێوانەیەت کرد ئەو بە تەواوی لە ڕێگەکەی خۆی لای دابوو و دەستی بۆ چاك وچۆنی یەکی گەرم و گوڕ لە کاردا بوو.

بۆ تۆ ئەوە هەر هیچ قسەی ناوێ، ئەو بۆ هەموو دۆست و برادەرێکی دیکە، دیبێتی و ناسیبێتی هەر وا بوو، ئاوا بەگەرمەوە پێشوازی لێ دەکردن وخوا خوای بوو یەکێکیان ئیشێکی پێ بکەوێ یا کارێکی پێ بسپێرێ و بۆی ئەنجــام بدات بــە تایبــەتیش هاوڕێ و هــەڤالانی قوتابخانە، ئەوانیش بە ڕێزەوە تەماشای ئەو سیفەتەیان دەکرد و بە لە خــۆ بوردویی و بێ فیزییان بۆ دەژمارد. ئێستا نەخوازەڵلا بۆ تۆ،ئەو بپە ڕژایە تا ئێستا سەدان جار خــۆی پێ نیشان دابویەوە. ئێستاش خۆت بەپێی خۆت هاتبێتیتە بەر لووتی ئەوە ئیتر بۆ ئەو هەلێك بوو، هەر مەپرسە.

سەرەتا کە گوتت ( گواسترا ومەتەوە ئێرە ) ئەوەندەی نەما شاگەشکە بێت. لە دەمێك دا سەد بەخێرهاتنی کردیت. قسەکەی وەك هەڵو لە دەم قۆستیتەوە. دواییش کە هەلی قسە کردنت چنگ کەوتەوەو وتت ( هاتوین بەڵکو هەلی بوە شێنینەوە )، ئەو تەواو خاو بوەوە و ەك

یەكێك بدرێ بەبنا گوێی دا گێژو وێژ بوو و هەر ئەوەندە هاتە زمان وتی ( ئینجا لێرەش بیت چی تێدایە وای دانێماڵی خۆت لێرەیە. ئێمە لە ئاستی تۆدا خاوەن ماڵ نین ).

ئەم قسەیە بۆتە كلێشە. خەڵكی بێ كێشانەو پێوانە بەیەكی دەڵێن و لەیەكی دەبیستن. بەڵام زۆر سەرنجی تۆی ڕاكێشا. بە خۆتت وت « تۆ بڵێی ژن وماڵی هەبێ یاهەر وەكو جاران خۆی و دایكە بێوەژنەكەیەتی ؟ ! ».

كبرییای كچێك هەرگیز ڕێگەی نادات لە كات وشوێنێوا دا لە كوڕێك بپرسێ ( ئەرێ ژنت هێناوە یا نـە ؟ ) بۆیە لە جیـاتی ئەوە سـەرنجێكی دەست وپەنجـەت دا. بەڵام هـەر دڵت دانەكەوت. ئێستا بۆتە باو هەندێ پیاو كە لە ماڵ هاتنە دەرێ ئەنگوستیلە كەیـان دەخەنـە گیرفانیانەوە بۆیە بە سەر سوڕمانەوە لە خۆت پرسی « كێ ئەڵێ ئەمیش وای نەكردووە ؟ !... تۆ بڵێی ئەمیش وای لێ هاتبێ ؟ !... ».

ئەویش دوای ئەوەی لە قسەكەی بوەوە یەكسەر لە خۆی پرسی بوو « ئەرێ بڵێی شووی كردبێ ؟ » بەڵام بۆ ئەو پێویستی بەو هەموو هێنان وبردنە نەبوو و پێویستیشی نەدەكرد لە خۆت بپرسێ، لێك كردنەوەی ژن وكچ بۆ پیاو ئاسانەو وەك لێككردنەوەی پیاوو كوڕ نی‌یە بـۆ كچ. ئەنگوستیلەشت لەدەست نی‌یەو دایكیشت لە تەگ دایە. ژنیش ئەنگوستیلە ناخەنە گیرفان و مێرداریش دایك ناخاتە لاتەك.

بێ دەنگی یەكەتان لە پێویست پتری خایاند، تۆ زووتر هاتیتەوە سەر خۆ گورج پرسیت ( ئەی تۆ.. تۆ ئێستا لە كوێیت ؟ ) ئەویش لە وەڵام دا وتی ( من دەمێكە لێرەم ).

ڕۆشنایی‌یەك كەوتە دڵتەوە لە دڵی خۆتا وتت « دە باشە كەواتە دەیاننا سێ و دەتوانێ یارمەتیم بدات » ئەویش لە دڵی خۆی دا دەیوت « سەیرە... جاری واش دەبێ ـ خۆشە ویستی ـ ڕێی یارمەتی بگرێ... یارمەتی چی ؟ !... یارمەتی چۆن وا دەبێ.. ئەمە پاروو لە دەم خۆ دەرهێنانە...! ».

[illegible]دەم ڕاچڵەكانەوە یەكسەر پرسی ( ئێ.. ئێستا چیتان كرد. بە تەمای چین ؟ ) تۆش [illegible]ت وەڵام دایەوە ( لە [illegible]یانی یەوە هاتووین. بەڕێوەبەری گشتی لێرە نی‌یە، دەڵێن لە وانەیە تا [illegible] [illegible]ێری یەكێش نەیە[illegible] ئێمەش تازە هەر هاتووین، هاتوین دەڵێم چاوەڕێی دەكەین بەڵكو بێتەوە، دەڵێن هەر بەدەست ئەویشە. ئەرێ تۆ دۆستایەتیت لە گە لادا نی‌یە؟ ).

ئەویش وتی ( ئا... ڕاست دەکەن لە گەڵ هەندێ میوانی بێگانەدا زوو چوونەتە سەیری جێ پرۆژەیەك... دەشێ دوای یەکیش نەیەنەوە. پێکەوە نیوە ڕۆژە دەکەن. )
بەلام بە دەستیئەنقەست وەڵامی پرسیارە کەتی پشتگوێ خست و نەیووت دۆستایەتی لە گەڵ بەڕێوەبەردا هەیە یانە و لە بری ئەوە تەماشایەکی ـ کات ژمێر ـ ەکەی دەستی کرد و وتی (هێشتا سێ سەعات پتری ماوە.. ئەوەندە وەختە ئێوە چۆن لێرە دەوەستن؟.. هەر لێتان بەسەر ناچێ. بۆ نایەن بتان بەمەوە ماڵی خۆمان ؟ ! ). سەرنجێکی دایکتی داو ئینجا وتی (هەر دایمکی لێیە. منیش، بینایەکی نوێ هەیە دەبێ بچم وەری بگرم... ئێوە دەبەمەوە و دواییش سەعات یەك دێمەوە بە دووتان دا و دەگەڕێینەوە بۆ ئێرە... **ئۆتۆمبێلتان** پێیە ؟ ).
دایکت پێی خۆش نەبوو بەلام شەکەتی یەکەشی لە وەدا نەبوو بتوانێ **سێ سەعاتی دیکە** لەو سەرە ڕێیەدا بوەستێ. تۆش هەروا، جگە لە وەش حەزت دەکرد بچیت و **لە نزیك ترەوە**

تەماشایەکی حاڵ و باڵی بکەیت بۆیە بەدەم پێکەنینەوە وتت ( **ئینجا ئۆتۆمبێلمان هەیە تا پێمان** بێ یا نە ؟ ! ). ئەو جا ئەویش بە دەنگێکی تێکەڵ بە **تەریق بوونەوە** و **لە خۆبایی بوونەوە** وتی ( ئەوە گرفتێکی گەورەنییە.. دە فەرموون.. فەرموون.. **خۆم دەتان گەیێنم** ).

دایکت تەماشایەکی تۆی کردو تۆش تەماشایەکی دایکت و بۆی جولان. ئەویش بە فەرموو.. فەرموو پێشتان کەوت، لە دەرگاکەدا نەبێ وەستا تا ئێوە دەرچوون.
هەتا گەیشتنە ئۆتۆمبێلەکەی، تۆ بیرت لەوە دەکردەوە تۆو دایکت لە پشتەوە دانیشن یا یەکێکتان بچنە پێشەوە، بە خۆتت وت « خۆ تاکسی نییە هەر دووکمان لە دواوە دانیشین. ناش بێ دایکم لە پێشەوە دانیشێ، ئەو ئەز دەناسێت.. ئەی باشە من بە چ هەقێکەوە بچمە پێشەوە ؟
هەق بێ ونەبێ چار نییە، وەك ئۆتۆمبێلم نییە خۆ دەبێ ئوسووڵ بزانم... »
ئەو لەو کاتەدا دەرگای دواوەی کردبووەوە و خەریکی کردنەوەی دەرگای پێشەوەش بوو.

بەدەم زەردەخەنەوە فەرمووی لێ کردن. ئیتر پێویستی بە لێکدانەوە نەما ڕاست چوویت لە پێشەوە سوار بووی.
هەتا ماڵ هیچی لە گەلا نەوتن. تۆ وات دا نابوو هەزار ویەك پرسیارت لێ بکات وا دەرنەچوو. لە ماڵیش هەر ئەوەندەی وت ( تۆ... **ئەگەر فەرمانی گواستنەوەکەت پێیە** بمدەرێ

خۆم دەیدەمە بە ڕێوەبەری گشتی. لە گەڵ میوانە بێگانە کان دا ئێمەش دەعوەت کرابوین.. نیازم نەبوو بچم.. بەڵام کەوای لێهات بڕۆم لەوێ بیبینم باشترە.. دواییش کە هاتەوە جێی خۆی دێمەوە بە شوێن ئێوەش دا و پێکەوە دەچینەوە لای... ئەم کارانە وردەکاری کالوسی دەوێ. ). تۆش فەرمانە کەت دایە دەستی، بردی ورۆیشت.

دایکی کەوتە مشوور خواردنی نیوە ڕۆژە. تۆ دایکیشت بە تایبەتیش تۆ خۆت، وەك یەکێك لە خەو ڕاچەڵەکابێ بە چوار لای خۆت دا چاوت دەگێڕا و هەڵت دەڕوانی نەت دەزانی سەیری بکەی. بینای جوان. باخچەی ڕێك وپێك و ڕازاوە. ژووری میوان. ژووری نووستن. باری ناو ماڵە. تاخم و تابلۆ. وپەردە و گوڵدانی دەس هەڵچن وڕێك وپێك داڕنراو. هەر وا سەرت سوڕما. ئەوەندەت تاوتوکرد تا لە گیانی خۆت جاڕست بووی. حەزت کرد کتێبێکت دەست کەوێ خۆتی پێوە خەریك بکەی، چاوت بۆ کتێبخانە گێڕا. نەبوو. هەواڵت پرسی. دایکی وتی ( کتێب ومتێبی نی یە ). تاس بردیتیەوە « ئەم وکتێبی نەبێ !... سەیرە! ». داوای ڕادیۆت کرد وتی (دەمێکە تێکچووە... ئەوە هەر دەڵێ دەبیەم چاکی دەکەم و بیری دەچێ.. ئەوە تەسجیل. ئەوە ڤدیو ئەگەر حەزیان لێ دەکەی ؟ ).

لە دڵی خۆت دا وتت « خۆ منداڵ نیم.. خۆبۆ سەیران نەهاتووم.. تەسجیل وڤدیۆی چی بەم چێشتەنگاوە ؟.. ئەی باشە ئەمە بۆ بوتە بەردی بن گۆم.. نەڕادیو.. نە کتێب ! » ئینجا بە دایکیت وت ( قەی ناکا دێم یارمەتی تۆ دەدەم. ).

تا دەم ژمێری سێی ئێوارە چاوەڕێتان کرد. نەدەنگی هەبوو نەڕەنگ. پشووتان لە بەر بڕا، بە تایبەتی دایکت نەت ئەوێرا تەماشای بکەی، گورج دەیپرسی ( ڕۆڵە کوڕەکە نەهاتەوە). نەت ئەزانی چی وەڵام دەیتەوە. دایکیشی دەهات ودەچوو دەیوت ( قەت خۆی نی یە ئاوا دوا بکەوێ.. ڕێگای دووری لە ماڵەوەیە تا دایەرەولە دایەرەوەیە تا ماڵ.. شتێکی بە سەر نەهاتبێ باشە، دەنا تەلەفۆنێکی هەردەکرد. ).

هەموو دەست لە سەر دەست دانیشتبوون، تەلەفۆنەکە لێی دا. دایکی پڕی پێدا کرد. پاش هەندێك ڕازو گلەیی، بانگی تۆشی کرد. زانیت خۆیەتی. کەسی دیکە، لێرە، تەلەفۆن بوتۆ ناکات. ویستت گلەیی لێبکەی. دوودڵیش بووی. هەر ئەوەندەی دەمت هەڵ هێنا ئەو سەری لێ سەندی، بواری ڕازو گلەییت نەما. وتی ( دەبێ بم بەخشی.. لەو ساوە.. ئا.. ئێستا ئەوەندە هەلەم بۆ هەڵ کەوتووە، وتم با دڵیان لام نەبێ. ئاگاداریان بکەمەوە.).

پێت شەرم نەبوایە دەتوت ( ئەی تۆ بۆ مەسەلەکەی من چیت کرد ؟ بۆمنت وا دوا خست ؟ ئاخر من دەبێ بچمەوە شارێکی دیکە ). بەڵام ئەو خۆی وتی ( بۆ مەسەلەکەی تۆیش.. دڵ لە دڵ مەدە.. باش دەبێ ).

وتت ( چۆن؟ )وتی ( بەگوێرەی دڵی خۆت دەبێ.. ئێستا کاتی ئەوەم نی‌یە کە هاتمەوە تێت دەگەیێنم.. ). ئیتر ڕێگەی قسەی دیکەی نەدایت و بەپەلە پرۆزێ خوا حافیزی لێ کردیت.

کە تەلەفۆنەکەی خستەوە جێی خۆی لە بەر خۆیەوە وتی « تەواو.. ئێستاش دەچمە بازاڕ و یەك، دوو، سەعاتێکی دیکەش لەوێ بەسەر دەبەم، ئیتر بواری گەڕانەوەیان نامێنێ، خۆ ناشێ بچنە توتێلیش. شەوێکی دوور و درێژ پێکەوە دەبین. پێی دەڵێیم، بزانم چی دەڵێ.. نا.. بەدایکم دەڵێیم ئەو پێیان بڵێ چاکترە. پێشیان نەڵێ ئەو هەر سەر باسەکە بکاتەوە خۆم دەیڵێم... »

تۆش بە شلێکەوە تەلەفۆنەکەت خستەوە جێی خۆی. قسەکەی دڵ خۆشکەر بوو بەڵام نەت دەزانی چۆنی بە دایکت ڕابگەیێنیت، ئەو یەکێك لەم دوو شتەی دەوێ ( ئا یا نەء ). لە دوای نیوەڕۆشەوە پڵ وپۆی ڕۆیشتنەوەی بوو، خەمی شەوی لێ‌هاتبوو، هەر چەند سەرت هێناوبرد نەت زانی چی پێ بڵێی ئەگەر هەواڵی تەلەفۆنەکەی لێ پرسیت، خەریك بوو دڵ تەنگ بی بەڵام ئاوا دڵی خۆتت دایەوە « ئەوەندە هەر دەبا خۆخووم خانە نی‌یە لێی هەڵ کێشێ. ئەوان تا ئێستاش هەر لە میوانخانەکەن. ئەوە دەوامیش تەواو. تازە مەگەر بەیانی. بەیانیش تەواو بێ هەر باش. بەخوا ئەو نەبێ بەیانیش بە خۆم تەواو ناکرێ. بەس نی‌یە ئەمیشمان دیتەوە ئەگینا دەبوو بچینە ئوتێلیش. هەرچی چۆنێك بێ ئێرە وەك ئەوە وای لە ماڵێ خۆمان دا بین. دایکیشم قسەی کرد هەر وای پێ دەڵێیم. ئەی چی بکەین ؟. ».

خۆر ئاوایەکی درەنگ بوو کە هاتەوە. داوای لێ بووردنی لە خۆت و دایکیشت کرد. پاشان وتی ( بەیانی کارەکەت یەك لایی دەبێتەوە. ئەم شەویش پێکەوە بە سەر دەبەین، ماڵ ماڵێ خۆتانە ). دوایش یەك، دوو جار دایکی تاك کردەوە و لە تەك ئەویش دا وتووێژێکیان بوو.

ئێوە خۆتان تێ نەگەیاند.

دوای شام کردن، پاش سوێند و سوێندکاری‌یەکی زۆر، شتنی دەفروئامانەکان بۆ تۆ مایەوە. دایکی چووە لای دایکتەوەو هاوشانی لێ گرت. ئەویش لە ژوورەکەی خۆیدا خۆی خەریك کرد بووجار جاریش بە تیلەی چاو تەماشایەکی دایکی دەکرد کە هەرچەی دەهات. تۆ تێ نەدەگەیشتی چی دەڵێن. کە چوویتەوە کنیشیان ئەوان قسەکەیان بڕییەوە و ئەویش لە ژوورەکەی هاتە دەرێ و هات لە ڕیزەکەی تۆوە دانیشت.

هەمووبەبێ دەنگ تەماشای یەکترتان دەکرد. هەر هەمووشتان لە دڵی خۆتان دا بۆسەرە باسێك دەگەڕان، کۆتایی بەو بێ دەنگی وتەماشای یەك کردنە بێ واتا و مەبەستە بێنن. تۆ بە ماڵەکەدا گێڕایەوە، لە دڵی خۆت دا وتت « دەبێ چەندی تێ چووبێ ؟ ! »، بیرت بۆ دەسکەوتی

مانگانەی خاوەنەکەی چوو، دەسکەوتی مانگانەی ئێوەمانان هەر بەتەنها مووچەکـە نی‌یە. موخە سەسات و ئۆڤەر تایم وخەلا تانەو وشتی دیکەشە. مووچەکـەیت دەزانی. دەرچووی سالێکن و ئەو سالو نیویك بگرە پتریش دوای تۆ دامەزراوە. ئەوە مووچەکە هیچ، دەمێنێتەوە ئەو دوایی، بە خۆتت وت « دەشێ لێرە وەك لای ئێمە نەبێ، لە هەموو شوێنێك وەك یەك نی‌یە بەدەستبەڕێوەبەر و لیپرسراوی ڕاستە وخۆیە. بەڕێوەبە ریش تا بەڕێوبەر جیاوازی هەیە. »، کە ئەم قسانەت ڕوو بەڕووی کردەوە ئەو زۆر بەگەرمەوە وەلامی نەدایتەوە لە بری ئەوە وتی ( ئەمانـە هەمـووی بخەیتـە سەریـەك ئەوەنـدەی دەسکەوتی مـانگانـەی تەرەفـرۆشێکی نەخوێندەوار نابێ. هەر باشیشە بەشی خەرجی ڕۆژانەی ناو ماڵیش دەکا. ).

سەرت سوڕما، بە خێرایی چاوێکی دیکەت بە ناو ماڵەکەدا گێرایەوە. لە دلی خۆت دا وتت « پیاوباشترە، ئێواران دەتوانێ لای بەلێندەرێك بۆخۆی کار بکات و لە مووچەکەی خۆشی پتری دەسکەوت دەبێ. » ئنجا پرسیت ( ئەی ئێواران کار ناکەیت ؟ ). وتی ( ئێوارانیش هەر کار بکەم ؟ !./. چی بوو ؟ ).

هەر پەشیمانی کردیتەوە، بۆ ئەوەی پێتەوە دیار نەبێ بەبێ هەستی چاوێکی دیکەت بە ماڵەکەدا گێرایەوەو بە خۆتت وت « ئەی ئیتر ئەم نازو نیعمەتە لە کوێ ؟ ! ». ئنجا کپ و بێ دەنگ لێی دانیشتیتەوە، ئەویش هەستاو ڕۆیشت لەو سەرەوە هاتەوە ئەلبوومێکی بە دەستەوە بوو دەس بەجێ تێگەیشتی بۆقسەکانتی لە کورتی دەبڕی‌یەوە. دانیشتەوە و لە سەر خۆیەك، دوو پەڕەی ئەم دیوو ئەودیو کردو پەنجەی خستە سەر وێنەیەك وسەری هێنایە پێشتەوە و وتی ( گەشتە زانستی یەکەی دوکان).

قوتابی‌یەکانی بە شەکەتانی گشت تێدا بوو. تۆ دانیشتبوویت وئـەویش بە دیـارتەوە وەستابوو. تەماشایەکی یەکتان کردو بزەیەك نیشتە سەر لێوتان. ئنجاپەنجەی بۆکوڕ و کچێك درێژ کرد و وتی ( ئەرێ پەیوەندی نێوان ئەم دووانە بەچی گەیشت ؟ ). وتت ( نازانم.. لە کاتی دەمەزراندن دا ئەمیانم دیوە ) ئنجا تۆش پەنجەت خستە سەر کچەکە. کـەچی خۆی

هەلێدایە ووتی ( دوو منالیشیان هەیە. ). پەڕەیەکی دیکەشی هەلدایەوە.

بەلام دایکت، بە باوێشکێکی دوور و درێژ سەرنجی هەمووتانی ڕاکێشا بەلای خۆی دا. ئەووای دانا ئەمە هەلێکەو بۆئەو ڕەخساوە. ئەلبوومەکەی داناو ڕاستە پێ هەستایە سەرپێ ووتی (دایکە بەخوا لەوە دەچێ « پورم» خەوی بێ. ماندووە. جێگەکەی پێشان دەی باشە ).

هەر گورجیش دانیشتەوە ودەستی کردەوە بە ئەم دیو وئەو دیو کردنی پەڕەکانی ئەلبوومەکە و سەرنج ڕاکێشانی تۆ. دایکی و دایکت هەستان و ڕۆیشتن. دایکی گەڕایەوە و دایکت بەجێ ما. تۆش خەوت نەدەهات بەڵام نەت دەزانی دانیشی یا بڕۆی. لەم ... ە وردەیا بووی، دایکت بانگی لێ کردی. کە تۆ دات کێشا ڕۆیشتی ئەویش هەستایەوە سەرڕێی دەستێکی لە بەر و یەکێکی لە دوا، هەتا لە دەرگاکەش چوویتە ژوورەوە لە دواوە تەماشای کردیت.

دایکت تەماشایەکی جێگەکەی کردیت. ئیتر پێویستی بەوە نەبوو بە دەمیش پێت بڵێ ( بچۆ لە شوێنەکەی خۆت ڕاکشێ ) خۆت لەو لایەوە ڕاکشایت. هەستت کردبوو شتێکی پێیە ها ئێستا ها نەختێکی دیکە دەیدرکێنێ. هەر واش بوو، پاش بێ دەنگی یەکی گران وکەم خایەن وتی ( هەق نەبوو بارگرانی بخەینە سەر ئەم ماڵە. ) و ئیتر بڕی‌یەوە و لە سەری نەڕۆیشت. زانیت چاوەڕێی قسەیەك دەکا لە وەڵامیا، بۆیە وتت ( ڕاست دەکەی بەڵام باوەڕ ناکەم خۆیان لە بەریان گران بێت. پێیان خۆش نەبوایە وا بەگەرمەوە خزمەتیان نەدەکردین ). بێ دەنگ بوونەوە. ئنجا ئەو وتی ( خزمەتەکەیان بێ مەبەست نەبوو. ). وتت ( بۆ ؟ ! ). وتی ( داوای تۆ دەکەن ). پرسیت ( کێ پێی وتیت ؟ ). وتی ( دایکی ). زانیت دایکت لە بەری گران بووە، خۆشت سەرسام ببووی. بەڵام وات بە باش زانی جارێ دڵی ئەو بدەیتەوە بۆیە وتت ( ئنجا چی تیا بەسەرە خۆ بە زۆر گلمان نادەنەوە ؟ ! ). وتی ( نەء.. بەڵام ) دروست تر وا بوو بێن لە ماڵی خۆمان دا داوات بکەن... ).

دایکی لەو کاتەدا هات ولە دەرگاکەوە پرسی ( ئەرێ هیچتان ناوێ ؟ ) تۆش وتت ( نەء... سوپاس ).

ئەو شەوە تا بەرەبەیان ئەنوزتان نەکرد. ئەو تا وتووی دەکرد و توش دەتکێشا و دەتپێوا، هەر چەندت دەکرد و دەکۆشایت دەری نەدەهێنا، بە خۆتت دەوت « ئەگەر گشت مووچەکانی ئوتۆمبێلەکەیە ئەی خانووەکەی لەچی‌یە. ئەگەر خانووەکەیە ئەی ماڵەکەی لە چی‌یە ؟ ! » ئاخری یەکەی بۆت ساغ نەکرایەوە. سەر ئەنجام گەیشتیتە ئەو بڕوایەی کە ئەمە تا سەر نابێ دەمەوبەیان کە سەرینەکەت نایە ژێر سەر یەکسەر خەو زایی یە چاوت.

بەیانی زوو دایکەکەی دەرگای پێ گرتن. دەیزانی دایکت قسەی بۆ کردوی. چاوەڕێی وەڵامەکەی بوو.

دوای نان خواردن. تۆ هەموو شت ومەکەکانی خۆتانت پێچایەوە. هیچت بەجێ نەهێشت. ئەو و دایك تینیان بۆ هات و خێرا خێرا تەماشای دەستی تۆ و یەکتریان دەکرد. ئەو خۆی بۆ نەگیرا و وتی ( تۆ هەر جانتاکەی دەستت بێنە، کێ دەڵێ ئەمڕۆش کارەکەت جێ بەجێ

دەبێ ؟ ! ).

دایکیشی هەڵی دایەوو وتی ( کچم تۆبۆوا بەپەلەی.. کێ دەڵێ ڕێوی نەهاتووە بە پیرتەوە کەس نازانێ خێر بەچییەوەیە. پەلە مەکە. ) بە دەم قسەکردنیشەوە پەیتا پەیتـا سەرنج دایکتی دەدا دەیویست ئەویش شتێك بڵێ، بەلام کە هەر نەیوت. ئنجا خۆی خۆی ڕووی دەم لێ کرد و پرسی ( نازانم بۆ مەسەلەکە چیتان کرد ؟ !، ئەگەر... ئاخر دوایی بە هەزار دەست ما کردن ـ گواستنەوەی ـ ئاوامان دەست ناکەوێتەوە. لە بەر ئەوە شم بوو، لێرە لە ماڵی خۆمان پ وتن دەنا دەزانم دەبوایە بهاتمایە خزمەتتان، وتم با ئەم هەلەمان لە دەست نەچێ. ).

ئێوە هەر دووکتان چاوتان داخسبوو. دایکیشت هەر ئەوەندەی وت ( هیچ... جارێ لێ گەڕێین چاکترە. ) کە وتی یەوە ( بۆ.. ؟ ! ). ئنجا دایکت لە کۆڵ خۆی کردەوەو تەما شایەک تۆی کرد و وتی ( ئەوە خۆیەتی خۆ مناڵ نی یە.. بە خوی بڵێ بۆ ؟ ).

دایکت ناهەقی نەبوو تۆ نە شەو و نەبانیش رای خۆت پێ نەگوت. دایکی ئـەویش هەلێکی وا دەگەڕا ڕاستەو خۆ لە گەڵ خۆتا بدوێ بۆیە گورج ڕووی دەمی تێکردی و وت ( کچە شیرنەکەم نەئێمە لە تۆ هەڵ کێشرا وترمان چنگ دەکـەوێ و نەتـۆش لە ئێمە بـاشد شوودەکەی. خۆت کوڕەکە لە ئێمەش چاکتر دەناسیو پێکەوە بوونە.. ئێ خوا نەیبڕێ ئەو ماڵ ئەوە ئۆتۆمبێل. ئەوە خانووی چاك. لە هیچی کەم نی یە.. بە خوا لە هیچیش دا نی یە هەقی بە سەر هیچیشەوە نی یە... ئێ ئیتر بۆ ؟ ! ).

تۆش تا ئەو کاتە بۆ وەلامێکی شیاو دەگەڕای. کوڕەکە تێ بگەیێنی و دڵی پیرەژنەکانیش نەیشێنی، ڕێت پێ نە دەبرد. بەلام قسەکانی دایکی ڕێی بۆ کردیتەوە و پاش تۆزێك ڕامان وت ( بە خوا هە ر لە بەر ئەوانەیە کە وتت. دەنا خوا هەڵ ناگرێ عەیبەی دیکەی نی یە. ) ئیت بڕیتەوە و دەستت بۆ جانتاکان برد.

دایکی و دایکت دەستیان بە پێکەنین کرد. قسەکەتیان بە نوکتە زانی، بەلام ئەو خۆی تەواوی لە مەبەستەکەت گەیشت، بۆیە سەری داخست و گیانی لە ئارەقەیەکی لینج نیشت پێکەنینەکەی ئەوا نیشی بەم قسەیە لە گەروویان دا تاساند کە وتی ( دەفەرموون بابـڕۆ درەنگەبۆمن... ).

هەرچی دەسەلات وپەیوەندی تایبەتی هەبوو، ئەو ڕۆژە هەمووی خستنە کار و بەر کۆتایی دەوام فەرمانەکەی بۆ هەڵوە شانیتەوە و وەك ئەوەی هەر هیـچ نەبـووبێ، تاوەک گەراجیش بە ڕێی خستن. بۆیە تا ئێستاش کە باسێتە پێشەوە دایکت لە سەر خۆ دەپرس ( ئەرێ ماڵەکە دەنگیان نەبوو ؟ !. )

○

# دوانزەو چارەكی نیوەڕۆ

**- فەیسەڵ دێهاتی -**

گەیشتیەجێ - !

هەر لەگەڵ گەیشتنت ئۆخەتهاتێ.. ! ئا ئەوەتا دوو دەستەخوشكی لەگەڵ خوێدا هێناوەتە بەردەم دەرگای كۆلێژ، ئافرەتان دونیایەكی سەیروسەمەرەیان هەیە، ڕاوپرسی یەكتر لەم جۆرە مەسەلانە وەرئەگرن.. ! لەوەئەچێ ماوەیەكبێت چاوەڕێتبكات، سەرەتا خۆی كەنارگرت، وەك ئەوەی بڵێی ئاگاداری هاتنت نیە، پشتی لەتۆیەو ڕووی لەدەستە خوشكەكانیەتی ، ڕاوەستانەكەشی پیلانێكی تیایە ، دەستەخوشكەكانی زۆربەقوولی لێتئەڕوانن ، تۆش چەند مەترێك لەوان دوورڕاوەستای ، تەماشاكردنیان چاوی كڕینوفرۆتنە ، ئەویش ئەدوا ، بۆ وان ئەداو ، بۆ وان ئەدوا ، لەگەڵ هەستكردنی بەهاتنی تۆ دوانەكەی بێسەروبەربوو ، لەدەستدانی كاتبوو ، تەنها خۆخەریككردن بوو تا ئەو دووكچە جوان لێترامێنن، باچاك لێمبڕوانن ، من باكم نیە ، چش لەخۆم شكنابەم ، بەڵام ئافرەت هەرچەند خۆشتی بوێ هێندەش تەونی گومان تەزووی بیری ئەئالۆزێنێ ، هەزارویەك ڕاو بۆچونی سەیرسەیر كەوانەی سەرژێكانی بیركردنەوەو هەستییەتی، من جارێكی دیكەش بێباكم ، كوڕێكی كەڵەگەت ، گەنمڕەنگ ، تاڕاوەیەكیش جوانم ، هاورێكانم ئەڵێن تۆلەئە[illegible]ری ، هەر مرۆڤێكیش جوانیەكی تایبەت بەخۆی هەیە ، بڕواناكەم مرۆڤی شیرین بوونی هەبێ.. ! ! ئەوە

زۆربەلامەوە گرنگ نیە، بەلام سەرجەم دوای ئەو ڕستانەم لێ هەڵوەشایەوە کەدامنابوو لەم دیدارە هەڵیان ڕێژم و دەریان برم و بیان دەرکێنم ، هەڵوەشایەوە ، باشە ئێستا چۆن چونی دەست پێ بکەم ؟ ! بە چ دەستپێ بکەم ؟ ! من زیاتر لەدووساڵە گومانم لەدڵدا ڕەویتەوە بەلام لەکۆمەگای باوکایەتی هەردەبێ کوڕ دەستپێشکەری بکا ، منێك پێنج ساڵی ڕەبەق بێ بەدەردی ئەوخۆشەویستی و ئەڤینە بتلێمەوە ؟ ! هەرئەبێ ئەمڕۆ بیدرکێنم ، خۆیشی ئەزانێ .. هەربۆیەش ئەو خۆی داوای لێکردم ئەم ژواتە ببەستین .. ! ! سەرنجم دایە بالای سنگ و بەرۆکی .. قژی .. قامکی ئەنگوستەکانی .. سمتی .. پاژنەی پێکانی .. ئەوەم وەبیرهاتەوە لەدیداری پار لەکۆڕەکەدا وەبیرم هات و لەتەوقەکردن دەستەکانیم گوشی ... گوشی .. گوشی چاك بوو ئەو « بەولاوبەم لای خۆیدا ڕوانی، ئەگینا ... ! ؟ ! ئای چی ئەکەی ؟ ! خەڵك چاویان لێمان بڕیوە ..! نیازی چیت هەیە .. ؟ ! ئارەقەم کردء ترپەی لێدانی دڵم خێراتربوو ، چوینە پشتەوە دانیشتین، ئەمویست بیگوشم ، بەخۆمەوەی نووسێنم ، تێرتێر ماچی بکەم ، من لەماچی تۆ تێرنابم ، ماچی پێنج ساڵ قەرزاری . ئێستا سلاوی لێ ئەکەم ، بەو کچانەش ئەڵێم بەیارمەتیتان ، بەجووتە بەرەو شەقامەکەی شەستی دائەبەزین، هاموشۆکەران بەدزەنیگاوە چاوەمان تێئەبڕن ، جارناجاریش هۆڕنی ئوتومبێلێك ئاورێکی ڕقاویمان پێ ئەداتەوە، ناسیاوو تەناسیاو چاوەدێری جوولەو هەنگاوەکانمان ئەکەن.

+ ئێ بەرەوکوێ .. بچین... لەکوێوە دەست پێ بکەین ؟ !

– خۆت ئەزانی

+ قسەم بۆبکە

– تۆ قسەم بۆبکە

+ باسی چیت بۆبکەم ؟ !

– خۆت ئەزانی ــ!
گورگی بیابان ء تاوان و سزا ء شێتی هیوا ء جەنگ و ئاشتی .. ؟ یا باسی شێتێ خۆم ؟ !

+ باسی تێکەوتنی خۆت و چاوشینە بێ ئابڕوەکە .

– چاوشین کۆتایی هات ، بلقی سەرئاوبوو ، من باسی خۆم ئەکەم و تۆش هاریکاریم بکە

بەباسکردنی دونیاو خەونە سەوزەکانی خۆت ، دوینای من تۆی چاوەنگوینی .. !

من.. ن..ن بەڕاستی و بێ پێچ پەنا تۆم خۆش ئەوێ.. تەنها تۆو بەس ، سەرەتا تەزووی
سادی لەرزێکی شەرم داگرتوو چاوی پێ دائەگرێ و ڕەنگی ئەبزرکێنێ ، ساتێك بێ دەنگ ئەبن و
پێلوی چاوەکانی لێك ئەنێ و قامکی پەنجەکانی ئەخاتە نێو دەستم و بەڕوویەکی گەش سەری لێم
بەرزئەکاتەوە بێم ئەڵێ:... بۆنازانی دەمێکە تۆم خۆش ئەوێ.. ! ! نەء.. نەخێر ئەو کچە هێندە
ساویلکەوسادە نیە ، بەکۆمەڵێك رستەی ناقوڵای فەلسەفەی ناو کتێبان و ئینجا
بەخۆکیف کردنەوەو خۆبەزل زانین ئەڵی باشە بابزانم.. بیربکەمەوە ، نەء نەخێر ئەڵێ تۆش وەکو
من شەمەنەفەری تەمەن لەم وێستگایە جێ ی هێشتووی ، بۆیەکترباشین ، نەء... نەخێر من وتۆ
هاوڕێین بەس ، نەء .. نەخێر ئێستاکێ زووەو بابەخۆماندابێینەوە بەتایبەتی تۆ سەرە ڕۆیت و
بەرەللایت، من هەستم کردووە دەمێکە یەکترمان خوش ئەوێ ، بەڵام ئەم خۆشەویستیە بازیاتر
بەناخمان ڕووبچێ.. ! باپڕۆژەیەکی ئاسایی وەك خەڵك بۆژیانی ڕۆژانەمان دابنیین ، ئەوسا
بڕیاری کۆتایی ئەدەین ، نەء.. نەخێر بەهەناسەیەکی قوول هەموو کەسەرو کەنەفتی و ئازاری
بەسفتی تەمەنی من و خۆی لەجەستەی خۆی ئەئالێنێ و خۆی ئەکا بەباوەشماو پێم ئەڵێ من
بەدوای تۆدا وێڵم ، خۆشەویستم... دڵم.. دەتێم بکەو من لێت گەیشتووم. نازانی چەمکی ژیان و
ڕەوشتە مرۆڤایەتیەکان پێ شێل کراون ؟ !.

* *

کەوتمە گێژاوێکی سەختی بێ ئامان و بێ سەروبن ، کەس ناتوانێ رزگارم کات ، هەرچەند
سەرنج ئەدەمە بالآت.. دوا دوای قژت.. کوڵەکانت.. لێوی بەخاڵت ، چاوەهەنگوینیەکانت..
ڕەنگی رەشەسمەرت.. چالایی گەردنت.. سنگت.. قامکی ئەنگوستت.. کەمەرت، خۆم بۆ
ناگیرێ ، تازووە باتێر ماچت بکەم ، باخوێندکارەکانی ئەم کولێژەی نەهێشتنی تەخوێندەواری
تێم ڕامێنن ، جرێتان بۆئەکێشم ، من تۆم خۆش ئەوێ هەر ئێستا داوای یارمەتی لەو دەستە
خوشکانەت ئەکەم... بەڵام پێ لەسەرئەوە دائەگری لەگەڵت بێمە ژوورەوە لەیانەی کولێژ
دابنیشم ، من نایێم ، رقم لەژوورە ، بەتایبەتیش ئەو ژوورانەی خەڵك ئاپۆرەی تیائەبەستێ ،
هەریەکە باراش لەئاشێك ئەهاڕێ ، من تەمەنم بەتەنهای لەژوورێك بەسەربردووە ، حەز
لەتەنیایی ئەکەم ، تەنیاییەك بەس تۆم لەگەڵ بێت، من و تۆ یەکین، یەك مرۆڤ و بەس ، خۆت

ئەزانی من لەقەڵەبالغی وەڕسم ، چونکە ئەوانە وەڕسن بەبێ هۆ ، ئادەی تازووەو نەمردووم
باتێرتێر لێت ڕامێنم ، ڕات مووسم ، ماچت بکەم ، نازانی مەرگ بۆئێمە مانان والەپشت دەرگایە ،
وابەرامبەرتە ، دووهەنگاو لێت دووە ، کچێ هەنگاوێك. هەرئێستا پێمان ئەکا.

باقەبارەی یەکتروەگرین، با لەئامێزی یەکتر چێژوەگرین و لەناویەکتر بتوێنەوە ! هەرئێستا
بەدەستەخوشکەکانت ئەڵێم بەیارمەتیتان ، نا تۆ خۆت یارمەتیان لێ وەرگرە ، دەستەخوشکە

کانت بۆوا سەیرمئەکەن ؟ ! خوازیاری ئەوەن تۆ منیان پێ بناسێنی ، ناخۆت ئەزانی من حەز لەناسین کەس کەم بشیان ناسم بەیانی ناویانم بیرئەچێتەوە ، ڕەنگیانم بیرئەچێتەوە ، من تەنها تۆ لەبیرناکەم ، دوورنیە بەیانی پێت بڵێن:۔

+ باڵای کورت بوایە جوانتر بوو

+ سوورو سپی بوایە.

+ خۆت پێیان بڵێ ی نەتانزانی کورد گوتەنی بەخۆوەتربوایە. بەراستی لەم سەردەمەدا زۆرجار مرۆ رووکارو ڕەواجێکی گەرمی لەبازاڕی ژن و ژن هێنان و دڵداریدا هەیە. جابۆنا... ؟ !

تەنها من نەبێ مرۆڤم خۆش ئەوێ ؟ ! مرۆ بێ و بەس ... ! تۆ بایەکێك بوای لەقولەڕەشەکانی ئافریقیا یان شازادەی ئیرلەندا هەرهێندەم خۆش ئەویستی کە ئێستا خۆشتم ئەوێ ! هەرئێستا بەدەستە خوشکەکانت ئەڵێم بەیارمەتیتان.. نەء لەراستە حیسابی کچو ئەخرێتە قالبی پایەدابەزاندن و خۆشکاندنێ کەسێتی خۆم ، هەرئەبێ خۆت داوای یارمەتیان لێ بکەیت ؟ !...تۆ هێندەت لەوان گەرەکە من ببینن و پاشان ڕای خۆیانت بۆدەربڕن ، جا چ لەمن تێ ئەگەن ، سەرگوشتەوهەڵەپاسی و هەرەشەو فشەو هەڵوێست و دۆڕان و ڕاستبوونەوەم یاداشتی دەفتەری مێشکتە، دوابڕیاریشت داوە بەلام هێشتا دڵنیانەبووی ، ناهەقت نیە.. هەقتە ، چاخێکی زۆلە ، مرۆڤ ئەمرۆمەربان هەرساتەو ڕەنگێك و سەنگێك و دەنگێك و ترێکن. ئای دڵنیایی... ! ئەزانم ئێستاکی دڵنیابوای بەبەرچاوی ئەم خەڵکەوە تێر ماچت ئەکردم، چونکە ئەزانی برینە زوخمدارەکانی لەشت دەرمانی لای منە ، لەشی پڕکفت و سوێت بەمن دائەکەوێ ؟ !

خۆم بۆناگیرێ هەرئەبێ بەدەستە خوشکەکانت بڵێم بەیارمەتیتان ، دڵنیام تۆش بیر لەوەئەکەیتەوە ، چەند ووشەیەك بکەیتە پاساوداتی یارمەتی وەرگرتن ، نا تۆ بڵێ ی چاکترە، تازووە پێیان بڵێ ، کێشەی نێوانمان زۆر ئەخایەنێ ، من و تۆ بەرۆژێك لێکتر تێرنابین، مەگەر شەوان لەسەر سەرینێك و باسکی نەرمی تۆ ، براوات هەبێ ئەوساکەش تێرنابین و هەمووشەوێك نوێ ئەبینەوە، بچووك ئەبینەوە ، ئەبینەوە منال لەگەل « دیهات » شەوان دەیان گەمەی منالانە ئەکەین ، ئەگەڕێینەوە ڕۆژانی کۆلان و شەقام ، تازووە یارمەتی ، ڕووت وەرسووڕێنە... دەی ... زیاتر.. بۆ هێندە لەسەرخۆی.. هەر سەیرم بکە... ئەوا تەوقەی قژی سەرت سووڕا ، گوارەی گوێچکەی چەپەت دەرکەوت ، روومەتت ، قاچکی بروت... چاوی چەپەت... نیوەی ڕووت.. منت بینی.. یارمەتیت وەرگرت... روخسارت هەمووی... ئا... ئا... بەلێ.. بەلێ.. دوانەکەوتووم.

٢٠ ـ ١١ ـ ١٩٨٨ هەولێر

# سەعەتەك ل جەم نۆژدارێ شادییێ

حسن سلێڤانی

(وەی بوشادییێ... وەرە ژوور وژانا بهێلە... شادییێ بیە..)

من ئەڤ پەیڤە خواندن دنیڤا دەپەکێ روهنکری ب گلوپەك سپی، ل بەر دەرگەهی ئاڤاهییێ...

ژمێژە وەرە من حەز دکر، ئەز هەرم جەم ڤی زانایێ دەروونی، ئەوێ دبێژت:

«ئەز شادییێ بو بەرگەرانێت خوە پەیدادکم.».. ئەرێ هوین ڤێ ئاخفتنێ باوەردکن ؟ ئێکێ ژوە ئەڤە زانایێ دەروونی دیتە ؟ کی دبێژت ئەو زانایە ؟

ئەو چما ئەز ژگەلەك تشتا بێ باوەرم ؟ ؟

دوانزدە پەیسکا ئەز بسەرکەفتم، دەمێ ئەز ل دەستێ راستێ زڤریم، ئەیوانەکا بچویك ب قەنەڤێت کەڤن وپێنج کورسیکێت تۆز گرتی ومێزەکا بێ سەرو بەر، هندەك گوڤارێت بیانی لسەر، کەت بەرامبەری من... ئەز دشێم سوند بخوم، ئەڤی نوژدارێ دەروونی، ئەڤ تشتێت هو کەڤن بیت ژ « بازارا هەرەج ل بابل تۆپی » کرین، دلێ بازێرێ ب تەناهی نفستی ل سەر هەردوو لیڤێت دجلەیا خێرێ...

من هێڤکرە ئودیو دیوارێت بێهنا گەنی ژێ دفری مینا چەرمێ سەیەکێ مری بەری چەند رۆژەکا... ل دیوارێ، بەرامبەری خوە، من دیت، کەڤالەکێ ب دەست رسمکری بو سەیەکێ، بێ یاریا دکت ب کەیف دگەل پشیکەکێ... ئەرێ ئەز ژێ بپرسم، چییە رامانا ڤی کەڤالی دەمێ دچمە دژوورڤە ؟ ئانژی دێ تورەبت ؟ لێ دبێژت نوژدارێت دەروونی زوی بزوی توررەنابن، ئو ئەگەر تورەبون، خوە ژ تەبەقا بلند دئاڤێن... ئەز دترسم ئەڤەژی خوە ژ پەنجەرکا ئودا خوە باڤێت وتەرمێ وی ببت سەوك، لسەر لێڤا چەعدێ، دا رۆژا دی، رۆژنامێت سپێدێ بەحسێ مرنا

زانایەکێ بلیمـەت دکاودانێت تـاریدە بکن، ئو داسـەیدابێت پشکـا دەروونی ل زانکوییێ ژ شاگردێت خوە، داخوازا نفسینێ بەرفرەهـل سەر ڤێ مرنا مەزن بکن... بێگومان ئەزدێ چەند هەیڤەکا بم مێهڤانێ پرسیارێت پوایساو دادگەهێ، چنکو ئەز ئەو کەسێ بتنێ بو، یێ سەرا وی

دای ئیروکە... ئوووە... هیڤیاژتە دکم نوژداریێ دەلال، چامێرەبە و خوە ژ پەنجەرکێ نەئاڤێ بەری تو من ببینی...

من تۆز ژ کورسیکێ داقوتا و هێژ ئەز باش ل سەر نەروینشتیم، ئەم پێگڤە کەتین و مە دەنگەکێ نە خوەش تژی ئەیوانێ‌کر...ئێکسەر ئەو دەرگەهێ ل بەرامبەری من ڤەبو، زەلامەک ژێ دەرکەت ب پانتولەکێ شین و گوملەکەکێ گولگولی، خیچ کێشەک سپی مینا پرچـا ل دور چێنیکێت‌وی، ددەستێ وی‌یێ ڕاستێدا بو..

- ماتو ئاگەهدار نابێ بەری ب روینێ ؟ ماتە نە دیت کورسی بەس بسێ پیانە ؟ !

ب ئاخفتنا خوە دگەل من، مینا ئێکێ دگەل زاروکەکێ باخفت، بوزانین سمێلێت‌من، بنێ کەبێ‌من هەتا سەرێ لێڤا خوارێ ڕەشکرینە... ئاوریێت وی غەریب بوون، دگاڤێدە چاڤێت خوە دنقاندن‌و ڤە دکرن... بڕاستی بوینباغا وی جهێ کەنیێ بو، کەسك بـرەنکێ داریێ و رسمێت کاغەزی میناییێت سنیلەیا ل‌سەر بوون..

- ببورە گەر من تو تورە کربێ... باوەرکەمن باش من بەرێخوە نەدا پێپکێت کورسیکێ.

بڕێزگرتن وتازەهی من وەگوتە ئەوی زەلامێ راوەستیای ل‌پێشیامن..

من کورسیکا دوێ ب‌دەستمالا خوەیا نەهاتی شوشتن ژ ئەینی‌یەکێ وەرە پاقژکرو ئەز روینشتم... ئەوی بئاوەرییێت پڕ پرسیار بەرێخوە ددامن، ئو پەیڤی:-

- تە ریپەکا هەی، مانەوەیە ؟ !

« ئەگەر من ریپەك نەبا، ئەز دا هێم ڤێرێ‌چی ؟ »

- بەلێ... ئو من دڤێت نوژداریێ دەروونی ببینم ئەگەر دەلیڤە هەبت..

بخوە گرنژینا وی ژێ، نەگرنژین‌بو، لێ‌سیتاڤکا گرنژینەکێ بو..

- کەرەمکە... وەرو ژوور... ئەز ئەو بخوەمە..

من هزر دکر ئەڤێ ل بەرامبەری من راوەستیای، ئێکە ژ هاریکەرێت وی، ئان سکرتیرێ وی‌یە...

روینشت ل سەر کورسیکا خوەیا زڤروك، من باوەرنەدکر ڤی نوژداری، دێ ئەڤ کورسیکە هەبت... من هزردکربتنێ مروڤێت مەزن گەلەك مـەزن وزك ستویـر ل سەر ڤـان کورسیکـا دروینن... بێ‌لێگدان هندەك کتێب‌ل سەر مێزاوی بـەلاڤەبـون... لەسەر سـەری، شکلەکێ

رەنگینێ مەزن بو زاروکەکێ چیبلاق تازی،، مینا من، ئان تە، ئان ئەوی، دەمێ ئەم ل ژیێ وی... دگرنژی بو چنە... ئان ژی بەلکی بو گەلەك تشتا ئەم نابینین و ترانین چنە... خوزی تەز زڤری بام زاروکەکێ ساڤا... وەی بو ژینا زاروکی یێ یا خوەش ل سەر لیڤێت خابوری شین وجوانیا بەژنا سپیندارێت بلند،، بێ وەستیان و هزر و ئالوزی... چەند خوەشە زاروکی !!

دوو خیچێت نە وەك ئێك لسەر دەفتەرا خوەیا بچویك کێشان...

خیچ کێشانك ل بەر ناڤچاڤێت من بلندکر و بدەنگەکێ تیژ مینا یێ سەیدایێ هژماری، ئەوێ هەر بجلکێت مەلا دهاتە مەکتەبێ وشاشکا وی یاسور هێژ یال بیرامن، دکر ڤیری چەند مەنەزانیبا دەرسا خوە، ئان مەتشتەکێ بچویك خەلەت کربا،، قەد عێجز نەدبو ژلێدانا مە ب حەیزەرانێ ژێ دوور نەدبو وەك شاشکاوی،، شوینا لێدانا وی ل دەستێت مە وەسا دیاردبو، وگەلەك جاران ئەم دگرین،، بەلێ ئەم دگرین.. ئەم بچویك بوون و سڕا چیای نەدزانی چی یە زاروکی...

ـ ناڤێ تە... ژیێ تە.. شولێ تە... ! !

« ئەڤە چی یە خودێ وو، مائەم دهولا دادگەهێ ڤەنە ؟ ئەرێ من گوننە هەك کریە وئەز نزانم ؟

ماهەوجەیی یەك هەیە بو ڤێ رێ یا رەقا پرسیارا ؟

ترسامن ئەوە، نەکو نوژدارێ من ئەڤە دین بت... خودێ وو سەبری بدەمن »...

ـ ل من نەگرە... ماپێتڤی یە تو بزانێ ؟ ئەز دبینم ئەگەر هەمە ئێکسەر ئاستەنکا خوە ژ تەرە بێژم چاکترە..

تبلا خوە یابەرانی کر د دفنا خوەدە،، دوو موی ژێ کێشان، دەستێ خوە ب کاغەزا لەسەر مێزێ پاقژکر... پێلێت کەنیێ دان پەی ئێك، ئو بکوتەکی من شیا کەنیێ خوە دگەوریا خوە دە بخەندفینم،، ماکی نابێژت ئەو دا وێ خولیدانکا شوشەیی یا چ شوینوارێت بنکێت چگارا و زلکێت شخاتێ لێ نەدیار، دمن وەرکت و تێ خەبەرا بێژت، ئەگەر کەنیی من دەرکەتبا...

ئەوی زەلامێ ل بەرامبەری من گوت :ـ

ـ بەلێ... بەلێ... زارویێ من، ئەڤ پرسیارە زور پێتڤی نە بو نوژدارێ دەرونی، دا هاریکاریا وی بکت بو چارەسەرکرنا نەساخێ خوە... ئو نوژدارێت دژی هزرێت بابلوڤی ژی، ئەڤی شولێ دحەبینن...

ئەز نزانم چەوا دوێ گاڤێدە ئەڤ ناڤە هاتن بیرامن :

کاربوف، عەرەب شاملیوف... ئەرێ ئەز پرسیارا نوشتێ زیانا کاربوڤی د پالەوانیا جیهانی یاشەترنجێ ژێ بکم ؟ نەء... نەء هەوجەنینە چنکو ئەزباش دزانم کەس ل جهێ خوە نامینت هەمی ژیێ خوە، ئەڤە ئێکە ژ تشتێت سروشتی دژینێ دە.. تەوچما ئەز ژ شێوەیێ

شاميلوڤى تێر نابم بو خواندنا داستانا « كەلها دمدمى ».. ؟ ئەو چما وێنەيێ قارەمانێ وى «خانێ لەپ‌زێرين » ژ پێش چاڤێت‌من ناچت ؟ خوەزى من زانيبا نهينىيا گازى‌كرناوى بو من،، ئەرێ ئەڤ نوژداێ دەروونى دزانت چى‌يە نهينىيا گازى‌كرنا وى‌بو من چاخێ حويت ژ ئاڤێ دەركەڤت و بو ئەسمانى دفرت ؟ !

- كوردو شەمدين كەريم.

- چى... گەردون ؟

- كوردو... كوردو... كاف، واو ، راء، دال، واو، كوردو

- ئەرێ ناڤێ تە نەيێ غەريبە ؟ ئانكو.. ئانكو نەپچەكێ گرانە ؟

- نەء.. ناڤە كێ سڤك‌و سانەهى‌يە... تنێ‌دگەل‌من‌بێژە

كوردو، كوردو، ئو دێ بينێ‌چەندێ خوەشە...

مينا نوكە باش يال‌بيرامن ئەو ڕوژا سەيدايێ ئامادەيى‌يێ ب دلتەنگى‌ڤە ژمن پرسى :-

- ئەرێ چى‌يە ڕامانا كوردوى.. هوو.. هووكوردو ؟ !

ئەز گرنژيم و ب ڕێزگرتنەكا موكم من گوتێ :-

- هەر مينا پەرسڤا تە، ئەگەر ئێكێ ژتە پرسى چى‌يە ڕامانا يەعروبى، سەيدايێ‌من...

ئەڤى سەيدايێ‌من حەژ پرسيار و گەنگە شێت‌من نەدكر، ياڕاست‌ژى ئەز گەلەك سەركەڤتى‌بوم ددەرسا ويدا، ئەز دبێژم ئەڤێ چەندێ‌ژى مێشكى وى دئێشاند... نوژدارێ دەروونى چ دلێ خوە نەڤەكرب ئاخفتنامن هەر وەك سەيدايێ ئامادەيى‌يێ...

- ئو ژيێ تە ؟

- سيهـ وسێ سالێ وپێنچ هەيف وچەند روژەك، هەر وەكى دلێستا حوكمەتێدە نڤيسى، ئەگەر ڕاست‌بت... « ئەرێ تو دزانى، ئەز ئێش گرتيێ گومانى‌يێ‌مە ژ ڕاستيا هەمى‌تشتا ؟ »..

نوژدارى ئەڤ زانينە لسەر وێ كاغەزا بچويك دنڤيسين...

- نوكە تول كيژێ ئاكونجى‌يێ ؟

- ل تاخا قە....... ! !

« ئەرێ ئەز بێژمێ ل تاخت قەرەچا ؟ ئەڤەيە ئەو ناڤێ من گولێ بوى ئەوە ئەز هاتيم ڤى بازێرێ، ئو خەلك هوسا دبێژنێ « تاخاقەرەچا » بەلێ هندەك‌قەرەچ بێت لێ هەين، بو خوە دگەڕن ب‌ئاشكرايى، ئو هندەك ژ ژنكێت وان شولێت پويچ دكن ل بن روناهيا تاڤێ، ئوئەڤ تشتە هەر وەسا ل گەلەك تاخێت دى ژى پەيدادبت، ئەو تاخێت خەلكێ تاخامە دبێژنێ « تاخێت ماقويل » هەر وەسا بچويكێت قەرەچا شولێ بوياغا پێلاڤا دكن، پێلاڤێت مەزنيت دروينى پشت مێزێت لێگداييێت مروڤ خوەتێرەدبينت، ئو ئوديت جوەش‌و بيهن‌فرەهـ،، مروڤێت قەت‌ناهێلن دەليڤە ژ وان ببوريت بو دزينا دەراڤێ داهيرێ،، ئو دەمێ كفش‌دبن، وێ‌ريپێ بستوويێت هندەك دى بێت ژخو، بچويكترل پەيسكا داهيرى ڤەدهێلن... ئەرێ‌ما ڤێت هەنێ نەقەرەچن ؟ ؟

ل سالێت دويماهيكى مەگول ناڤەكێ نوى‌بو، بوتاخامە « تاخا جەزائير » دەرمانگەها

جەزائیر،، وێنەگرێ جەزائیر،، دبستانا جەزائیر،، جەزائیر... جەزائیر... ئەڤ ناڤە ژ کیڤەهات ؟ کێ راکر ؟ ئەرێ دبیت ل سەر خاترا خودانا مەلیون شەهیدا دقادا روناهی یێ وسەربەسیتێ دە « جەزائیر »ێ ؟ ئانژی ئەگەرەکا دی یاهەی ؟ ؟

ـ تەخێرە ؟ تە پەرسقامن نەدا ! !

ـ ل من نەگرە،، تاخا جەزائیر...

« ئەرێ تو دزانی، ئەگەر سێ سەعەتا ل سەرئێك بارانێ لێکر، تاخـامە دنیڤـائاڤێـدە دخەندقت،، خرکولان وچەعدێت تژی کور هندا دبن ژ ئاڤێ... ئو زاروکێت تاخامە خوە دئێخنێ ب کەیفخوەشی، وەك کە یفخوەشیا زاروکێت تاخێت ئاڤاوماقویل و دەمێ خوە دئێخنا مەلەڤانگەهێت خوە بێت چیمەنتوکری ر روناهیێت هەمی رەنگل دوران... ئەرێ نوژدارێ بەرکەتی تو دزانی زاورکێت تاخامە، خەبەرو قەسێت رەش رەش دبێژنە دەیکێت خوە، هەر وەسا دەیکێت وان لێڤە دگێرن،، ئو دەلیڤەیەکا زێرینە ژ ڤیزێت سنێلەرە کو باقێت خوە نیشا تولازا بدن...

رێڤەبەرێ شارستانی یێ سوزا دای خەلکێ تاخامە، کو ژ دل دێ هـەولدەت، بو گـو هورینەکا مەزن، بەلکوچەعدا سەرەکی چێکن،، ئو دبیت کومێت بیساتیێ ل سـەرێ کولانێ نەمینن...»

ـ ها..ها.. تاخا جەزائیر.. ئەزباش ناس دکم،، بەردەستکامە یامالێ ژ وێ تاخێ یە، مالا سێ یێ ل دەستێ ڕاستێ، نێـزیکی « نەخـوشخانـا شاگـردا » ناڤێ وی زەینـەبە « ڕاستـە نەخواندەوارە لێ بێقام زیرەکە، تو ناس دکێ ی ؟

ـ نەء.. نەء...

ـ ئو شولێ تە چیە کوردو ؟

ـ هاریکەرێ ئەمینێ پرتوکخانا گشتی..

ئامیرەتەکێ ناڤنجی یێ تومارکرنێ ژ چەکمەچێ مەکتەباخوە ئینادەرێ،، کاسێتەك کـر دزکیدە و داشولی... هەردوو چاڤێت خوییێت ڤەشارتین ل پشت بەرچاڤکا رەش وستویر بلندکرن

وگوت:-

ـ دائەز بشێم ب موکمی چارەسەرکرنا تەبکم، دڤێت تو ڕاستگوبێ دئاخفتنێت خوە دە، ئو هەمی تشتا بئازادی بێژێ.. کا وب من بێژە تە چیە ؟ ؟....

« ئوهەمی تشتاب ئازادی بێژێ... وەی بۆ ئازادێ...

باش یال بیرامن، دەمێ من ژ دل، دەست قوتـاین بو کـوڕی ئادەمێ تـونسی، دەمێ ل بەراهیکا کورتە هوزانێت خوە.

گوتی:« چنکو ئازادی گەلەك مشەیە ل وارێت مە، ئەم دێ بو دەولەتێت دی بێت جیهانێ هنێرین.. »...

پشتی من خوە دروستکری ب روینشتنا خوە، ئەزب رەحەتیێ حەسیام:-

ـ ئەڤە دوو سالا پترن، خەون هێرشا ددن مێشکێ من... ئەز خەونێت پیس دبینم، هەتا کو

ئێدی ئەز نزانم رەحەتی چ رەنگە ! ! هەردەم سەرێ من گێژەو تژی ئالوزینە، تاهندەك جاران ئو ئەز نفستی، رادبم و ژجهێ خوە دەردکەڤم و برێڤە دچم وگەلەك شولا دکم ومن هایژ خوەنە... کابریسێت پیس یێت دناڤ لەشێ مندا پەیدابوین، ل هەمی لەشێ من دچن و دئێن مینا خوینێ... من دبن و دئینن وەك ڤیاناخوە... ئەز ئێخسیرێ وانم... هزرکە، ژنامن، بەلێ ژنامن، ئەوا ئەز بێقام حەژێدکم، من ڤیا ئەز بخەبدڤینم و ئەزنفستی،، بەلێ ئەزبەنی و ئەز نفستی.... من ڤیا ئەزوێ بینم دەرێ درەوین، لێ دەیکامن گوت، ئەگەر ئەز ل گەل ڤێریا وێ نەگەهشتبام، نوکە کەلەخەکێ بێ رح بو... هەو وەسا دەیکامن دبێژت، گەلەك جاران پشتی نیڤا شەڤی تو ژ مالێ دەردکەڤێ، دەمێ مە دڤێت رێ ل تەبگرین، تو دبێ گاورەکێ بەنی یێ بێ وژدان، ئەم ژ تە دترسین، خوە ژتە دویر دگرین؛ چاڤێت تە دبن دوو پەلێت ئاگرێ گەش، دیمێ تە تێك دچت... تو دبێ ترسەك مەزن، گەلەك مەزن... جاران زوی دزڤری و جاران هەتا بانگێ سپێدێ دمینێ ونائێ ی... تێشتاخوە دخوێ ی و دگرنژێ و دکەنێ هەچکو قەت چ نە قەومی... نوژدارێ شادی یێ، تودزانێ ئەڤ خەونەژبیرامن ناچت قەت :ـ

شەڤەکێ، من حویتەکێ مەزن دیت، یێ ژ روبیاری دەردکەڤت و بەرێخوە ددت من،، دفرت بو عەسمانی و نێزیکی عەورا دبت،، ژێ دبورت، هێدی هێدی دفرت بو هەیڤا گەش، ژێ نێزیك دبت،، دەڤێ خوەیێ فرەهـ مینا شکەڤتی ڤەدکت و هەیڤی دادعویرت، ئەو روناهیا گەشا لاو هندا دبت، تاری من و عەرد و عەسمانی دگرت،، ئو جارەکا دی حویت دزڤرت بـو روبیاری....ئـەز هەڤجاری باپیرێ خوە هلدگرم، رێیا روبیاری دگرم،، دا حیتی بکوژم،، هەیڤێ ژێ بستنیم،، ژ نشکەکی ڤە ئەز گورگێت تێهنی بو خوینا مروڤا دبینم ل پێشتا خوە و دبەردن من، ئەز بێ حەمد بچەکێ پاشڤە دزڤرم،، لێ خانێ لەپ زێرین ل من دکت ڤیری :ـ

ـ پاشڤە نەچە کوردو... ئەز دێ هاری تەکم... ئو مەزنێ گورگا مینا مروڤا دئاخڤت :ـ

ـ گوشتێ تە خوەشە لاوو... ! !

هێرشەکێ ددن سـەرمن... ئەز جهـدە هشك دبم، پێستیـرك من دگرت،، رەنگێ من و هێتەگوهورین،، پەیف دگەوریا مندە دمرن،، ئومیرزا محەمەد لسەر پشتا هەسپێ خوەیێ بوز دهێت ومن ژ عەردی هلدگرت ودئـاڤێت پشت خوە،، ومن ددەینت جهێ ئـەز لێ دژیم... وئەز هشیاردبم،، نە خانێ لەپ زێرین،، نەمیرزا محەمەدێ ڤێرس،، نەهەسپێ وی،، ئو هێشتا دەنگێ

گورگایێ دنیڤاهەردو گوهێت من دەدەنگ دڤەدن.... ئەز ژناڤ نڤینا دەر دکەڤم،، ژنا من ب من دحەست :ـ

ـ ئەز هیڤیا ژ تە دکم. نە دەرکەڤە ! ! تو بخودێ کێ ی نەدەرکەڤە...

چی یە گوننەها ڤێ ژنا نزانت تاما شادی یێ چەوانە ؟ ؟

باوەرکە سەیدایێ نوژدار، من هایژ خوە نینە، دەمێ ئەز ل زاروکێت خـو ددم ونڤینکا

دسوژم ودكەڤم ناڤ تشتێت مالێدا و دەرگەهێت جیرانا دقوتم...

ئێك دبێژت :-

- بهێلن... یێ دین بوی...

یێ دی دبێژت :-

- ئەرێ چما ئەم نائاڤین نە خوشخانا دینا ؟ مادین ب ئاخن ؟ ؟ ئو پیرە مێرەكێ پشت قوس ل وان ڤە دگێرت :-

- دێ بهێلن هەی مالا وەینوو... نێ خوەش مروڤە... ! ! ئەرێ تو... تو چ دبێژی نوژداری شادی‌یێ ؟

سەرێ خوە هەر هەژاند، بەرچاڤكا خوە ئێخست، دەیناسەر مێزێ، هێـژ لێڤێت وی ژ سەرئێك نەرابوین دا باخڤت، زرینا تەلەفونێ ئودە تژی‌كر...

ئامیرەتێ تومارکرنێ راوەستیاند، دەستكێ تەلەفونێ دا بەر گوهێ خوە :-

- بەلێ... ئەزم عیفان راضي

- ........ ! !

- وەی خودێ، تو چ دبێژی،، گەلەك هەرشی یە،، ئەڤە ئەز هاتم، هاتم...

شەبرزەبو گەلەك، دەست ئاڤێت چاكێتێ خوە و بە رچاڤكا خوە ژ بیركر، ژ لەزێ...

ئو ئەو دچو گوتە من :-

كورێ من یێ ل ترومپێلەكێ دای، نوكە یێ ل خەستێ،،

پشتی حەڤت رۆژێت دی وەرە...

ئەز ژی ل دویڤ دەركەڤتم، كەسەك ل ئەیۆانێ نە بو، ژبلی جحێلەكێ ب دشداشەیەكێ هەوجك فرەهـ، عەردێ ئەیوانا توزكی دمالی...

شوشەیەك حەبكا وەك ئەوا دبەریكا مندا، من ژ وێ دەرمانگەها مەزن كری... من قەستا جهێ راوەستیانا باساكر.. من بو خوە دگوت «ئەرێ راستە ئەز دینم ! ! یان دجیها نەك دیندەمە ؟ ؟ » ئو ئەز كەنیم... هندەك رێبارا هایژ كەنیێ من بون، براستی من شەرمكر،، ئومن بریاردا كو ئەز ب پیا بزڤرم مالێ، چفكو ئێشارەكا خوەش وڤێنك بو....

ئەرێ هویین باوەردكن ؟ ؟ ؟...

**١٩٨٦ / حديثة / الرمادي**

○

# بووكا يەك شەڤى

- نور الدين أنور بوّتانى -

ژسترانەكا زارگوّتا كوردا، من هزرا نفيّساندنا ڤىّ چيروّكىّ خوەندىيە.

(روتوّ)...، ئەڤ سىّ سال بوو دوّتماما خوە (خانم) دئەڤاند، دلىّ دوّتمامىّ ژى بوىڕا هەبوو، كەسەكى روتوّتونە بوو، تنىّ مامىّ وى هەبوو، ئەوبخوە باڤىّ خوە نەدى بوو، ديا وى ژى ژبەرى چەند سالان بژانا زراڤ مر بوو، مامىّ وى ئەو خوەدىو پەروەر كر بوو، حەيا عەمرىّ وى گها بوو دوزدە سالان ژنو ببوو گاڤانىّ گوند، چيلەكيّن گوند دچيّراند.

- ئيّڤاريك دەما ژئاقار دهات (لاوين) چوّبوو پيّشى يا وىوتەڤ خوە بربوو مال، ئەوهەردوو پشتى شيڤا خوە خوارن، ژخوەرا دئاخا ڤتنوگلىوگازنيّن خوە ژهەڤرا دگوّتن....

- ئيجار باڤىّ لاوين ژى خوە بەردا قادا دانوستاندنىّوگوّ....

- ئەرىّ روتوّ لاوو... ئەز دكم پرسەكىّ ژتە بكم وەكى توبەرسڤا من بدى.

- پرسا تە ئەمرە لسەرسەرىّ من، كەرەمكە ئاپىّ حەجى بيّژە.

- زالم توجارى لتە ئەمر نەكى ئيشەلا... كورىّ من...

لىّ من گوّڤەى نوژى مينا لاوين هزرا مالەك ئاڤاوخانيكەك خوەش ناكى ؟... نىّ دوّتماما تەژى مەزن بوويە، دەئيدى بەسە حەيا بكەنگىدە هونىّ ولوّ بمينن ؟...

- ئەڤ پرس و گۆتن ژ ڕوتۆ خوەش هات و د دلێ خوەدا گۆت:-...
- (وەی لا... ئەز خولامۆ ئاپێ حەجی... خودێ ژ دەڤێ تە بستینە و ڕەحمێ ب حالێ م بکە و خوارزتا دلێ من ب جی ببە.)
پاشی وەها بەرسڤا حەجی داو گۆ:-
- وەلەهـ ئاپێ حەجی.. ئەز ل بەرم تشتەك وەلێ ب جی بینم، لێ من دخوازت یەکی ب گۆتا مامێ من، کا ئەو چ دبێژە، نێ ئەو ل شونا باڤێ منە، یان نە ئەز شاشم ئاپێ حەجی ؟
- نە لاوۆ.. نە.. تو ڕاست دبێژی، لێ زانبە ژی کو مامێ تە، پر حەز ژتە دکە، هەر چاوا بە ژی ئەڤ
نە گرنگە، ئەگەر دەستورا من بدی ئەز ێ نها پشتی نڤێژا عیشا هەرم مالا وان و داخوازیا تە ژێرا بێژم، چکو زانم تو پچکێ شەرمنی و نکاری ڤێ یەکێ ل ڕوێ مامێ خوە قال بکی.
- دەستور ب تە ڕایە ئاپێ حەجی.
- ئاپێ حەجی پشتی نڤێژێ... (مەلا خەلیل) و (سوڤی سمۆ) و (دەروێش حەمۆ) ب خوەرا برن و بەر ب مالا (سیتۆ)
- مامێ ڕوتۆ کەتن ڕێ.... گهان دەڤێ دەری.. تەق... تەق... دوو - سێ جار تلێ خوە ل دەڤێ دەری دان و کەتن هوندر.
- ئەسەلامو عەلەیکوم.
- وە عەلەیکومو سەلام و سەر چاڤێ من... کەرەمکن ڕونن...
هون کەلەك ب خێر و سلامەت هاتن.
- کا وەرە کەچا من خانم، چایەکێ ژمەرا چێکە، پاشی نڤێژا خوە بکە ؟
- مەلا خەلیل گۆ:- ئەستەخفیرەللا.. نە کەچا من نە... نڤێژا خوە بکە پاشی ؟
- سینۆ گۆ:- کەچا من یان بێژە دیا خوە بەرە چایێ ژمەر چێکی، سەپدا ڕاست دبێژی.. گونەهە ! نر نڤێژا خوە بکە.
- هون کەلەك ب خێر و سلامەت هاتن ئەی مێڤانێن ئەزیز.
- ئەڤان گۆ:- خێرا خودێ ل تە بە و ڕەحمە ل دێ و باڤێ تە بە.
- سەیدای دەست ب خوەندنا دین و ئۆلی کر و سیرەت و پرسێن فەنج ل حازرا کر.
- دەما چا هات بەر وان کو ڤەخون.
- حەجی گۆ:- سینۆ... ئهێ سینۆ.. ب ئو جاخا مالا شێخ ئەم چایا تە ڤە ناخون یان تو ڤێ چایێ حسیب نەکی شیرینیا ڕوتۆ و خانمێ ؟. باوەرکە ژی کو هاتنا مە ب وێ مەرەمێ یە، جا تو چ دبێژی ؟....
- سینۆ گۆ:- حەجی.. هاتنا وە سەر سەرو چاڤێ من.. لێ هون ڤێ ژی بزانن کو ڕوتۆ کوڕێ منە و خانم ژی کەچا منە. ئو من ب خوە ژی نیەتە کو ڤێ یەکێ ب جی بینم، لێ.
- گەلۆ هون خوارزتا ڕوتۆ دبێژن یان نە ...؟ .
- ئەڤان گۆ... ئەرێ... ئەرێ ئەم ل سەر خوارزتا وی هاتنە.

- سینۆ گۆ:- پا مادام ووسایە، چ ژڤێ گاڤێ خوەشتر نینە.

ڤەخون چایا خوە ڤەخون نە، شیرینیا کورو کەچا من ڤەخون، لێ دا پرسەکێ ژی ب خانمو دیا وێ بکم، کما ئەو چ دبێژن، ما نەوەیە سەیدا ؟.

- بەلێ... بەلێ.. بەرە ئەو ژی یا خوە بێژن.

- خانمو دیا خانم ژی گۆتن، گۆتنا مە یا.

سینۆیە، ئەو چ دبێژە وەهایە، یانی هەردوو ژی رازینە.

- حەجی لنگێ خوە لبایێ بەزێ خستو گۆهون لڤر بن ئەڤە ئەز ژۆم ڕوتۆ بینم ڤر.

- ڕوتۆ هاتو دەستێ مامێ خوە ماچ کرو خانم ژێ قەبوول کر، مەلا ژی حازرە، هەر دوێ شەڤێدە خانم لڕوتۆ مەهر کرن.

- سبێ چاوا کو گوندی ئەو زانی، تەڤ پێ دل گەرمو کێف خوەش بوون، ژلەورا ژی گوندی گەلەك، ڕوتۆ دئەڤاند.

خۆرتو تۆلازێن گوند ژی سۆز دان کو خانیکەك خوەش ژڕوتۆرا چێ کن.

خانیکێ گوند ژی ژئاخێ چێ دبەو زوو بەرهەڤ دبە، خاسمە کو کۆمەك خورتێن دەست هەل یاردەمێ هەڤ بنو دەستێ ئالیکاری‌یێ ژهەڤرا درێژ کن.

- ئاخر... ئەوانا خانیك ئاڤا کرنو دوو - سێ بارێ قامیشو قرشکا ژی ئانینو ب سەر خێنی وەرکرن، تنێ مابوو سەرێ خێنی ب ئاخ بکن. گۆتن ئەڤێ بووکێ ڤەگوهێزنو چەند ڕۆژەکا ڤەهێسن، پاشی ئەمێ وەرن سەرێ خێنی ژی ب ئاخ بکن.

سبەکێ زوو، دواەتا ڕوتۆ دەست پێ کربوو، قیزو بووكو تۆلازو خورتێن گوند ژی خوە ب جلێن کەسكو سۆرو زەر خەملاندی بوون.

گاڤ (تێلی) ب دەنگێ یێ دل شەوات دستریو گۆڤەندو دێلان گەرم دبوو، تۆزێ بەرێ عەسمێن دگرت.

گاڤ ژی (خورتۆ) یێ بلورڤان خوە ب نێیف گۆڤەندێدە بەرداو ب تلێ یێن نەرمو سڤك، ئاواز لپەی ئاوازا دخوەندو دەنگێ کەچو بووکاو دەنگێ تلیلیا ووسا بلند دبوو، ووسا بلند دبوو، تە دگۆ دکهێژە ئاسیمانێ هەفتان.

چەند پیرەکێن گوند ژی هات بوونو فراڤینو شیڤو خوارن ژداوەتیارا چێ دکرن، دوو - سێ بارێ دارا لور بوو، قازانو مەنجەلێن مەزن ژی لسەر تفکێ خویا دبوو، دبن دا ژی گوڕیا ئێگر خوەش دکر.

زارۆکێن گوند ژی لهاویر دۆر گۆڤەندێ خوە دهلاڤێتن یاریا چوچکانێ دکرن.

یەکی دوو تلێ دەستێ خوە ڕادکرو دگۆتە هەڤالێ خوە چوچك ب چەندێ ؟ . وی دگۆ ب دووا.

ڤێجە زارۆیێ یەکان لدۆر گۆڤەندێ دبەزیاو هەڤالێ وی دوا پەی حەیا بگرتا، ئیجار وی دگۆتە یێ دی چوچك ب چەندێ ؟. ولۆ یاری دەرباز دبوو.

پشتی بانگێ نیڤرۆ بستران گۆتن و چەپك لێدان و ڕەقس و سەماو تفەنگ تەقاندن خانما بووك ڤەگوهازتن خانیکێ خوەش و نوێئاڤا.

داوەتی مان حەیا پشتێ بانگێ عیشا، پاشی هەمی هەرکەس بەر ب مالا خوە ڤەگەڕان.

ڕوتۆ وێ شەڤێ ما دگەل دۆتماما خوە و کێف و حەنەك و لاقردی‌یێ خوە کرن حەیا بەری بانگێ سوبێ، ژنشکاڤە هەردوو ڕازان.

هەر دوێ دەمێ دە باهۆزەکا خورت و ب هێز دەست پێ کر. چاوا کو باهۆزێ دەست پێ کر، ئاگرێ تفکێ خوەش کر، ب خوەش کرنا ئاگر، باهۆزێ پێتەکا ئاگری ڕاکرو بسڤاندا خێنیڤە دادا، بووك و زاڤایێ یەك شەڤی ژهلم و بێهنا ئاگری شیار بوون ڤە و ئاگرێ مالك شەوات ب خێنیڤە دیتن.

هەردوو بەزین ئاگری ڤەمرینن و پێراژی هەوارا خوە دگهاندن گوند.

هایا ڕوتۆ زدۆتماما وی تونە بوو، دەما پێتەکا ئاگری بەربوویی فیستانێ وێ.

خانم کر بوو هەوار... هەوارە.. هەوارە.. ڕوتۆ ئەز سۆتم!

ڕوتۆ ژی ب لەزو بەز خوە ددۆتماما خوە وەرکر بوو.

لێ ئاگر گها بوو بسك و کەزی و پەرچەماو تەڤ سۆت بوو. خانم ل ور درێژ کرو گوندی ژی گهان هەوارا وان و تەڤ ل بەر سەرێ وان ڕاوەستان.

ڕوتۆ سەرێ دۆتماما خوە ڕاکر بوو و دابوو بەر سینگێ خوە.

ـ خانم ب دەنگێ خوە یێ نزم و مەلوول گۆ:ـ

ـ گەلی گوندی‌یا... ئەگەر ئەز مرم تنێ داخوازەکا من هەیە ! هونێ من ڕاسەری مەخەلێ ڤەشێرن، جی‌یێ کو هەرۆسبێ چێلەك لێ کۆم دبن، ولۆ ئەز ژی هەرۆسبێ بەژنا لاوکێ خوە یێ دەلال... پسمامێ خوە یێ ژارو بێ کەس و هەڤال... زاڤاو سێوی‌یێ مالا باڤێ خوە ببینم.

ـ نەء.. نەء.. خانم ڤا گۆتنا مە بێژە، ڕوتۆ گۆت.

تێ چاوا بمری، ئەزێ نها تە ببم دەر بدەر، کۆچە بکۆچە، ل بازاران، ل جەم نوژداران، ل نەخوەش خانان بگەڕینم، یان تو دل ددی من تنێ دڤێ دنێ‌دە بهێلی ؟ . !. نێ ژیان پشتی تە ل من حەرامە.

ـ ڕوتۆ ئەز ب قوربان، هەو ئەز مرم، تو ژحالێ من نەمایە، تێ چاوا [illegible] بیی بازاران، نێ ئاگر گهایە هاناڤاو دیارە خودێ ژی ڤەدەرا من ووسا ئانی‌یە، کر ب ڤی ڕەنگی بمرم... تو ژی خوە ژکەرەما خودێ بێ حەمدی مەکە، ئەو گونهەك مەزنە.

ـ نەئ... نەء.. دۆتمامێ.. تو نامری.. نێ تو بووکا یەك شەڤی و دڤێ تو نە مری.

ب زۆرو کۆتەکی گۆتن ژڤێ ڕوتۆ دەردکەت و پێرا ژی هێستر ب سەر ڕۆێ خانمێ ڤەدباراندو جارنا ژی ئەنیا دۆتماما خوە ماچ دکر.

تاڤا سبێ ژنو دەردکەت و چێلەکێن گوند ژی یەکو ـ یەکو ـ یەک لمەخەلێ دبوون.

ژنشکاڤە ڕوتۆ حس کر کو ئەنیا خانمێ سار بوو وسەرێ وێ ژی ل بەر سینگێ وی ڤە خوار بوو.

ئیجار پیرا (سیڤێ) ژی هیزارا بووکانی یێ ئانیو بسەر لاشێ خانمێ دا کر.

ڕوتۆ ژجی یێ خوە ڤە جنقی و ڕاوبوو وکرە هەوار.

هەی هەوارە مالا من شەوتی....

دۆتماما من مر........

تێلی لسەر خوازتا دێ و باڤێ خانم و خوازتا ڕوتۆ..

ئەڤ ستران لسەر چێکرو ب دەنگو ئاوازەک دل شەوات ومەلوول شێوراندو گۆ:ـ

لۆ لۆ ڕوتۆ تو نەماوۆ.

خانی سوت و دیوار ماوۆ.

شەڤکێ پێڤە بوو زاڤاوۆ.

دبەر خانم تیر ڕانەزاوۆ.

... ... ...

... ...

...

داوی

O

# دەرد

عەکید شەفیق حەسەن

١٦ / ١١ / ١٩٨٦ سیارەتویکا

چاغێ وەریسکێ هزرێد خو دادهێلا ڕۆژێد بورین هندەك بیرهاتنێد خۆش و دلڤەکەر د هـاتنە بیرێ و بشکوڕینێ لێڤێد وی ژ سەرك ڕادکرن، بو دەمەکێ کێم د ناڤ وان د یمەن و وێنەو ڕویدانادا د ژیا.. چنکی پێلا ئەڤرو یا تژی خەم و نەخۆشی و ژان سەرێ هزرێد وی د بڕین و وەریسکێ وی دپچاند، گرێ و ڕهێد ناڤ چاڤا لێ تەحل و ترش د کرنەڤە.

من گەلەك حەژ سوحبەت و ئاخفتنێد وی د کرن، چنکی هەمی د زان ژ کانویکەکا زەلال، چنکی گەلەك سەربۆڕ ل سەری هاتبوون، سینگێ گەلەك ئارێش و ئاتافا سمت بوون.. ئاخفتنێد وی ل جەم من ب سەنگ و بها بوون، هەرچی ڕۆژا ساهی شیابا عەورا ب ترسینت و ب کـەتەدەر، چـاڤێ ڕۆژێ ژ خەلکی و واری ڕا ب کەت دیاری، دا ڤەستا بەر بەڕوشکێ گوندی کەم ل ڕەخ ڕوینم خار و هندەك ئاخفتنا بو دەرگەرهێ سوحبەتەك مەزن ڤەکەم، ئەو ژی ب درێژی و کویری د چوو ناڤدا و زێرو دڕو گەوهەر د باراندن.. ڕۆژەکێ بەربەرکی نیڤرو بو عەورا دەستێ هەڤ بەردا، ژێك ڤەتەقین، ڕۆژێ کرە کەنی و تیرۆژکێد خو بەردانە سەر بەفرا سپی و بو تپ ـ تپا وێ ژ داروباری و سیڤاندا کەت و وەری یا.. من خو گەهاندە بەر تەنشتا وی و پالێ خودا دیواری و ئاهەك ڕاهێلا و گوت:

ئەڤە چ دەردە ئەم گرتین ؟ !!

ب فرەهیا چاڤا بیستەکێ ل من نێڕی و لێڤێد خو ژ سەرك ڕاکرن:

ئەڤە دەردەکێ گشتی یە وەك وێ تەڕگێ یە ئەوا ئاڤارێ گوندی هەمیێ د گرت و کولیلکێد خـڕ داروباری د وەرینت نەکو چەمەکی د گرت و خودانێ وی نزا (دوعا) د کەت کو هەمی چەما بگرت، چنکی

چەمێ وی هەر چوو « تەڕکێ قوتا چەمێ من یا خودێ بێت تەمەد سەرێ من ».. ئەڤ دەردە نە وەك ئێشکەکێ‌یە ل هناڤ یان لەشێ کەسەکی ب تشقلت و هێزێ ژێ ب مێژت و بێ چارەکەت، هەتا وەك مارێ پێڤە دەت و تژی دەڤ و دفنا ئاخ کەت.. ئەڤ دەردە غـەزەبا خـودێ‌یە ژبـەر زۆرداریێ و زاڵمیێ و بێ مروەتامە یا ل مە تشقلی دا ل سەر جیهانێ و بن جیهانێ د تاوان بار بین و د دۆژێ‌دا بژین ! !

ئەڤ دەردە بێ مەژیێ و خرابی یا مەیە نە ڤایروس و ئوشتەك دن هەیە.. هەر ئێك ژ مە یێ ڕێکا خود ڤەوژێرت و ،ستریێ وکناریا د کەت بەر پێ هندەکا.. هەر ئێك ژ مە یێ دەستێ خوێ بەرویکا خوڤەدنت و گومێد خود گرت دەمێ دەنگێ هەژارەکی نەلەنگازەکی ب مەلوبلی گولێ د بت.. لاوێ من ئەڤ دەردە ژ هندێ‌یە چنکی ئەم هزرا سوبەهی ناکەین، چاڤێ مە یێ ل ئەڤرو ب هەرچی ڕێکا هەی ئەمێ هەوڵ د دەیین بلند ب نێرین و بفڕین هزرا کەتنێ ژی ناکەین ! ! !

دەردێ مە چاڤ لێکرن و د سەرداچوونە ! !

پنیەکا عەوری داڤێد ڕۆژێ برین و چاڤێ وێ یێ زەروگەش نخافت.. گوپالێ خودا بەرخوولوکزی ڕێکا ماڵ گرت.. من ژی هزرێد خوکویر د ئاخفتنێد وی‌دا د کرن دەمێ چپکێد بارانێ هاتین و پێد من سڤك کرین.

○

---

* بنیاتێ ڤێ گوتنێ «تەڕکێ قوتا ڕەزێ من یا ڕەبی بێت هندی سەرێ من »..

**محەمەد بەدری**

● کاتێ هونراوەیەکی راستەقینەی باش لە دایك ئەبێ، شاعیرەکە، واتە داهێنەری هونراوەکە هەست بەو فێنیکی‌یە ئەکات کە لە ناخی دەمارو دەروونی‌دا ئەگەشێتەوەو حەسانەوەو ئارامی و هێمنی پێ ئەبەخشێ.. واتە مەسەلەی لە دایکبوونی هونراوە کارێکی میکانیکی نی‌یە.. مانای ئەوەیە شاعیری راستەقینە ناتوانێ بە ئارەزووی خۆی ئەو کاتە هەڵبژێرێ و شیعرەکە بخولقێنێ..

شیعر هەست دەبرینەو حاڵەتێکی حازر بە دەست و ئامادەکراو نی‌یە کە کەی بیەوێ دروستی بکات و چۆن حەز ی لێ بێ بێتە کایەوە..

شیعر بۆچوون و روانینی ئەو مرۆڤە تایبەتی‌یە خاوەن هەست و هەڵچوون و گریمانەیە کە شاعیری پێ ئەوەترێ بەرامبەر بە سروشت و ژیان و دواروژ بە مەبەستی لێکدانەوەیان و بەرپاکردنی شۆرشێکی هوشیارانە دژ بەو کەرەستەو داب و نەریتانەی کە ئەبنە هۆی شێواندنی ریرەوی ژیان و ئەبنە کۆسپ و تەگەرە لە رێگەی بەرەو پێشەوە چوون و پەرەسەندن.. شیعر ئەنجامی تاقیکردنەوەی کاروانی مرۆڤایەتی‌یە بە درێژایی مێژوو ئەو هەستە پیرۆزو بە نرخەیە کە بەو فریشتەیە سپێرراوە کە شاعیری پێ ئەڵێن و بووەتە ئەرکی سەر شانی و بیەوێ یان نەیەوێ ئەبێ بیری لێ بکاتەوەو هەوڵ بدات بۆ جێ بەجێ کردنی.. واتە.. ووتەی شیعر زۆر لەوە گەورەترە بتوانین لە چوار چێوەی چەند ووشەو رستەیەکی سووك و ئاسان سنووری بۆ دابنێین.. چونکە زۆر لەوە گەورەترە ئێمە لە گەڵ لێکدانەوەی رۆژانەو شێ کردنەوەی ئەم و ئەو بەراوردی بکەین، ئەگەر ئاواش نەبێ ئەی بۆچی هەموو کەسێك لە خۆیەوە نابێتە شاعیرو شیعر نانووسێ ؟..

لیۆن تۆلستوی دەربارەی شیعر ئەڵێ:

( شیعر ئەو ئاگرەیە کە لە ناخی مرۆڤدا ئەسووتێ.. ئاگرێك شت ئەسووتێنێ و گەرمایی ئەبەخشێ و ئەگەشێتەوە..

هەیە کە هەست بە سووتاندنەکەی ئەکات و هەیە کە هەست بە گەرمایی‌یەکەی ئەکات و هەیە لە

رووناکی‌یەکەی بەو لاوە هیچی‌کە نابینێ، کومەڵێکی‌تر کە زۆر کەمە، ئەو کۆمەڵە ئەو رووناکی‌یەش نابینن، زۆر جاریش لای جەماوەر وایە کە شیعر ئەبێ تەنیا رووناکی ببەخشێ.. زۆربەی نووسەرەکانیش هاوبەشی ئەم بیروڕایەی جەماوەرەکە ئەکەن، بۆیە مەشخەڵەکە هەڵئەگرن و ڕێگەی ژیان ئەگرنە بەرو وا هەست ئەکەن کە ئەم جیهانە پڕ لە ئازاوەو تاریکی‌یە تەنیا رووناکی‌یی پێویستە.. بەڵام شاعیری راستەقینە ئەوەیە کە ئازار ئەچێژێ و خۆی ئەتوێنێتەوە نەك بۆ ئەوەی لەبەر چاوی خەڵقدا ببێتە تیشك و رووناکی بەڵکو بۆ ئەوەی گڕ لە خەڵقەکە بەر بدات... )..

● شیعر بەهرەیەو رەنگە تا ڕادەیەك لەگەڵ ئەو رایەش بم کە هەر شاعیرێك شەیتانێکی هەبێ، ئەگەر وا نەبێ، ئەی بۆچی ئەو لە هەموو دەقیقەیەك شیعری بۆ نایێ؟ ئەی لەبەرچی کە شیعری بۆ دێ مووچرکە ئەیگرێ و هەڵئەچێ و بە بیرو هەست و هۆشەوە لەم دونیایە دوور ئەکەوێتەوەو غەیب ئەبێ؟ ئەی بۆچی کاتێ لە شیعرەکە ئەبێتەوەو بە تایبەتی ئەگەر هات و هونراوەکە هونراوەیەکی بە سۆزو راستەقینە بوو، هەست بە حەسانەوەو خامۆشی ئەکات و وەکو لە سەفەرێکی دوورو درێژەوە هاتبێتەوە وا ئەبێ؟

ئەڵێم رەنگە تا ڕادەیەك لەگەڵ ئەو بیروڕایە بم، بەڵام نە بە شێوە ئاسایی‌یەکەی، نەبەو شێوەیەی کە ئەو شەیتانە دەست و پێی و دەم و چاوی هەبێ، بەڵکو بەو شێوەیە شاراوەیە سەیرو سەر سووڕ هێنەرە کە رەنگە دەروون ناسەکان و پسپۆڕەکانی بایلۆجی پیان بکرێ لێکی‌بدەنەوە. شیعر بەهرەیە، زۆر راستە، بەڵام ئەم بەهرەیە ئەگەر بێت و دەستی لێ نەدرێ و هەر وەکو خۆی چونە وازی لێ بهێنین و شاعیرەکەش هیچ هەوڵ و تەقەلایەك نەکات و دەست بە ئەژنوو دابنیشێ و بڵێ من شاعیرم و خاوەن بەهرەم، هیچ پێویستیم بە شتێکی‌تر نی‌یە، مانای ئەوەیە ئاو بێنەو دەستت بشۆ.. چونکە لە ئەنجامدا و رۆژ بە دوای رۆژ ئەو بەهرەیە خۆی دووبارەو سێ بارە ئەکاتەوەو لە دواییشدا ئەو شاعیرە هیچی پێ نامێنێ و وشك ئەبێتەوەو ئەوەی ئەیڵێ ئەبێتە قسەی ناو بازار...

واتە بۆ ئەوەی ئەو بەهرەیە کپ و خامۆش نەبێتەوەو هەمیشە گورج و زیندوو کارامە بێ، ئەبێ بە هەمیشەیی ئاگامان لێ بێ و بە سرووشی تاقیکردنەوە مرۆڤایەتی وەربگرین.. شاعیری راستەقینە ئەو کەسەیە کە بەدرێژایی ژیانی خۆی بە قوتابی‌یەك دائەنێ، هەمیشە خەریکی هەوڵ و تاقیکردنەوەو تەقەلا کردن ئەبێ، ئەروانێتە کاروانی رۆشنبیری بە گشتی و بە بۆچوون و روانینی کە لە شاعیرانی جیهان رۆشنبیری‌یەکەی خۆی دەوڵەمەند ئەکات.. ئەبێتە خوێنەرێکی بێ لایەن و لەگەڵ ڕێبازو تیووری جۆر بە جۆر سەفەر ئەکات بێ ئەوەی بهێڵێ کاری تێبکەن.

بەڵێ شیعر بەهرەیە، بەڵام ئەبێ بە هەمیشەیی خەریکی تیژ کردن و جوان کردن و دەوڵەمەند کردنی بین بۆ ئەوەی لە رۆژان وشك نەبێتەوە.

● کاتێ شاعیر هەست بە سووتان و گرتێبەر بوون ئەکات و ژان ئەیگرێ و لە هۆش ئەچێ و ماڵئاوایی لە دەوروبەری خۆی ئەکاو بەرەو بزربوونەوە ئەفڕێ، کاتێ شاعیر بە خۆی و هەموو دەمارو سۆزو برین و هەست و نەستەکانی‌یەوە ئەبێتە رووبارێکی هەڵچو لە ئەرزو ئاسمان جێگەی نابێتەوە، کاتێ شاعیر هەست بە بێزاری و خەم و خەفەت ئەکات و لە هیچ شوێن و کاتێکدا ناتوانێ ئۆقرە بگرێ، وڕ ئەبێ، هەست بە گێژی و ئاوارەیی و نامۆیی ئەکات، ئا لەو کاتەدا شیعرەکە لە دایك ئەبێ، لەو کاتەی کە

شاعیرەکە خۆیشی نازانێ بۆچی گیروودەی ئەم حاڵەتە بووەو هۆی ئەم جۆرە هەست کردنەی چی‌یەو بۆ چی‌یە.. ئەمەش ئەوە ناگەیینێ کە رۆڵی هەست و عەقڵ و بیرکردنەوە ئەبێتە سفر، نەخێر، چونکە ئەگەر وەها بێ ئەی چۆن ئەو ووشەیە لا ئەدات و ئەو رستەیە ئەگۆڕێ و چۆن ئەم وێنەیە ڕاو ئەکات و وێنەکەی تر پشت گوێ ئەخات ؟

عەقڵ و هۆش و هەست و بیرکردنەوەو زەمینە رۆشنبیری‌یەکەو دەردو بریــــنی واقیع و دوا رۆژ بینین.. ئەمانە بە گشتی یەك ئەگرنەوەو بە شێوەیەکی زۆر کاریگەرو وردو ئاڵۆز پێکەوە کۆتایی بە ژانەکە ئەهێنێ و شیعرەکە لە دایك ئەبێ و پاشان هەموو شتێك بەرەو حاڵەتەکەی جاران ئەگەڕێتەوەو خێوەتی هێمنی و خامۆشی بەسەر ئەو گرکانە بێ ئاسانە ئەدرێ..

● راستگۆیی مەرجێکی هەرە سەرەکی‌یە لە مەسەلەی داهێناندا، شاعیر ئەبێ بروای بەو شتە بێ کە دەری ئەبڕێ و مامەڵەی لەگەڵدا ئەکات، راستگۆ بێ لە گەڵ خۆی و ئەو دەبڕینە بۆ چەواشە کردنی خەڵقی و سەر لێ شێواندیان نەبێ، یان بۆ ئەوە نەبێ خۆی وا پیشان بدات کە رۆشنبیرەو علیمی ئەوەلین و ئاخرینی ئەزانێ و جەماوەرە بەستەزمانەکەش ئەبێ توانای ئەوەی نەبێ لێی حاڵی ببێ.. واتە خۆی و نووسینەکەی یەك بن و لە یەك جیا نەکرێنەوە.. وەك ئەوە بێ داوای شارەستانیەتی ئەکات کەچی بە بیرکردنەوە لادەیی‌یەو بەدوای تیرەگەری ئەگەڕێ.. ئەدۆنیس دەربارەی داهێنان و شیعر ئەڵێ ( شیعری راستەقینە لە سێ شت پێك دێت... یەکەم روانینی شاعیر، واتە هەڵویستی بەرامبەر بە جیهان ( بۆ ئەوەی بزانین ئەو جیاوازی یە چی‌یە لە نیوان شاعیری نوێ و کۆن بەرامبەر بە خۆشەویستی و ئافرەت و کەسانی ترو جیهان.

دووەم زمانی شاعیرەکە بۆ ئەوەی بزانین شاعیری کۆن و نوێ چۆن زمان بەکار ئەهێنن. سێیەم شێوەی دەربڕین بۆ ئەوەی بزانین شاعیری کۆن و نوێ چۆن شێوەیەك بەکار ئەهێنن بۆ دەربڕینیان..

بەلام ئەوەی لەم سێیانە زۆر سەرەکی و گرنگە روانینی شاعیرەکەیە واتە هەڵویستەکەیەتی چونکە بەبێ ئەمە شیعرەکە ئەبێتە هەڵچوون و وڕێنەی پچر پچری لابەلای بێ رەگ و ریشە بۆیە بێ کەڵك ئەبن..

واتە بڕوا کردن و خۆ بەستنەوە بە شتێك بە شێوەیەکی راست و راستەقینە وا لە شاعیر ئەکات رەوشت‌وکردەوەی رۆژانەو هەڵویستەکانی هاوتای دەربڕینەکەی بن، لە گەڵیا یەك بگرنەوەو لە ناو یەکتردا بتوێنەوە.. لە گەڵیا رەسەنایەتیش خاڵێکی زۆر گرنگە، دەربڕینەکە ئەبێ شتێکی نوێ بخوڵقێنێ، زیادکردنەوە بێ نەك دووبارە کردنەوە، ئەبێ وێنەو روانین و بۆچوونێکی تازە بێ، وا لەو شاعیرە بکات، شیعرەکەی بناسرێت بێ ئەوەی ناوی خۆی پێوە بێ، زۆر جار وا روو ئەدات مونراوەیەك ئەخوێنێتەوە ناوی داهێنەرەکەی پێوە نی‌یە، کە چی تا ڕادەیەکی زۆر ئەتوانین بریاری ئەوە بدەین کە ئەم شیعرە هی فلانە شاعیرە ئەم نیشانەی رەسەنایەتی شیعرەکە و شاعیرەکەیە چونکە توانیویەتی ببێتە خۆی، چونکە وەکو (رینار) ئەڵێ رێباز ئەوەیە کە گشت رێبازەکانی تر فەرامووش بکەیت...

مانای ئەوەیە خاوەنی رێبازی خۆت بی و بگەیتە تاقەکەسی..

یان وەکو یەکێکی تر ئەڵێ: رێبازەکە مرۆڤەکە خۆیەتی..

● بازدان بەسەر زەمەنیشدا مەرجێکی ترە بۆ سەرکەوتنی شاعیر لە بواری داهێناندا، چونکە شاعیری وا هەیە کە لە پێش هەزار ساڵدا شیعریان نووسیوە، کەچی بۆ هەموو کات و سەردەمێك دەست ئەدەن و هەستیان پێ ئەکەی کە شاعیرێکی هاوچەرخ دایان ناوەو تەعبیر لە گیروگرفتەکانی مرۆڤی سەدەی بیستەم ئەکەن، ئەمە بە راستی نیشانەیە بۆ نەمری و بەردەوامی ئەو شیعرانە کە بڕوایان بەکات و شوێن نی یەو دەربارەی هەست و بیروڕاو دەردو خەفەت و ئازاری هەموو مرۆڤێکی ئەم کەونە گەورەیە ئەدوێ، ئا ئەمەیە شیعری جیهانی بە واتا فراوانەکەی کە سنووری ناوچەیی ئەرۆخێنێ و بەرەو جیهان لە ڕێگەی وەرگێرانەوە ئەڕوا، کەچی بە هەزارەها شیعرو شاعیر هەنەو هەبوونەو بە سەدان و بە هەزاران شیعر نووسراو ن، بەلام نەیانتوانیوە لە سنووورە ناوچەیی یە تەسکەکە بەهەنگاوێك بەرەو دەرەوە بچن، بەڵکو ئەتوانین بڵێین کە تەنانەت لە چوار چێوەی ئەو ناوچەیە تەسکەش کەس بیریان لێ ناکاتەوە، چونکە نەیانتوانیوە لە بواری راستگۆیی و رەسەنایەتی نزیك ببنەوە..

رەنگە هەندێ کەسی بلێ، ئەو شیعرانە سووك و ئاسانن، بۆیە زوو لەبەر ئەکرێن و ئەمەش دەبێتە هۆی مانەوەیان.. نەخێر..

چونکە ئەگەر بێت و بۆ ئەم بۆچوونە ئەم پێوەرە بەکار بهێنین، ئەبینین بە هەزارەها شیعری سووك و ئاسان هەبووە، ئەی بۆچی لەناوچوونەو بۆ مەسەلەی لێکۆڵینەوە کەس ئاوریان لێ نادا تەوە.. ئەو شیعرانەی لەبەر ئەکرێن خۆیان فەرز ئەکەن، چونکە رەنگدانەوەی هەستی مرۆڤ و جەماوەرن بەرامبەر بە خۆشی و ناخۆشی و گۆڕین و دوارۆژو خەم و ئازارو خوێنەر کاتێ چاوی پێیان ئەکەوێ، هەست ئەکات کە خۆی نووسیویەتی، واتە خوێنەر خۆیی تیایاندا ئەدۆزێتەوەو ئەبنە هاندەرێ بۆ وەجێ هێنانی دوارۆژێکی نوێی بێگەرد.. لێرەدا ئەوەمان بۆ دەر ئەکەوێ کە حاڵەتێکی تر دروست ئەبێ، ئەویش یەکبوونی خوێنەرو شیعرەکەیە، شیعرو شاعیر لە ناو یەکتریدا توانەوە، لێرەشدا شیعرو خوێنەر، کە واتە حاڵەتە نوێیە مەبەستەکە هاتە کایەوەو رۆڵی شیعری رەسەن لە مەدا دیار ئەبێ، یەك و یەك و یەك نابێتە سێ، بەڵکو ئەبێتە یەك، شیعرو شاعیرو خوێنەر بوونە یەك شت، پێکەوە توانەوەو حاڵەتێکی نوێ پەیدا بوو کە گۆڕینەکەیە، تەجاوزکردنی حاڵەتە کۆنەکەیەو بەرەو پێشەوە هەنگاو نان و بنیادنانەکەیە..

پۆڵ ڤالیری دەربارەی ئەم مەسەلەیە ئەڵێ ( هونەر لەسێ شت پێکدێ یەکەم دانەر دووەم کارە هونەری یەکە سێیەم ئەو خوێنەرەی کە زەوق لە کارە هونەری یەکە وەرئەگرێ و لە دواییشدا بە هۆی ئەو بەرهەمە هونەری یە دروست ئەبێ.. بە واتایەکی تر.. ئەو خوێنەرە پاش توانەوەی لە ناو کارە هونەری یەکە ئەیخوێنی ئەبێتە خوێنەرێکی ترو بە روانینیکی تر چەکدار ئەبێ کە بەهۆیەوە ئەتوانین لە گۆڕینی جیهان بەشداری بکات.

● بەکارهێنانی رەمز لە شیعردا دیاردەیەکی جوان و کارامەیە، رەمز چ بەشێوەیەکی ئاسایی بێ یان بە وێنەیەکی هونەری بێ یان روانین و بۆچوونەکە بە گشتی بگرێتەوە، بە هەر حاڵ و شێوەیەك بێ شتێکی پێویستە، بەلام داهێنان و هونەرمەندی لەوەیە کە شاعیر بزانێ چۆن خۆی لە رەمز ئەدا، چۆن رای لێ ئەکات خزمەتی مەبەستەکەی بکات، چۆن ئەو رەمزە ئەکاتە ئەنگوستیلەکەی سلێمان پێغەمبەرو بە درزی دەرزی یەکی بچووکەوە ئەچێ.. وێنەی هونەری سەرکەوتووش کاتێ ئەبێتە رەمز حاڵەتێکی بەرزو داهێنەر پەیدا ئەبێ، رەمزیش بە هەمیشەیی ئەبێ لە خزمەتی مەبەستەکە بێ، واتە شێوەکە

ئەبێ ببێتە پردێك بۆ گەیاندنی ناوەرۆکەکە، هەر چەندە کە ناوەرۆکی گرنگ و باش و راستەقینە خۆی ب
خۆی شێوەی سەرکەوتوو ئەهێنێتە کایەوە..

● ئەمەی دەربارەی ئەوتری بۆ بەکارهێنانی ئەفسانەو داستانە میللییەکانیش ئەبێ، گەرانەو
بەرەو کەلەپوورو سامانی نەتەوایەتی و دەست بە بژار کردنیان شتێکی زۆر بە جێیە، شاعیر ئەبێ
شارەزای مێژوو کەلەپوورو زمان و ئەدەبی میللەتەکەی بە گشتی بێ، پێویستە بە ناو دیوان
شیعرییەکاندا بگەرێ، شیعرەکان بخوێنێتەوەو لێکیان بداتەوە، چاك و خرابیان لە یەك جیا بکاتەوە.
مەبەسم ئەوەی داهێنانەو ئەوەی سووك و ئاسان و راستەوخۆیە، ئەو ئەفسانانە ببینی کە رۆح
جموجۆڵ و هەڵس و کەوتی میللەتەکەی تیایاندا دیارو ئاشکرایە، چونکە مەسەلەی داهێنان و بەرە
پێشەوە چوونی لە دوێنییەوە دەستی پێ ئەکات کە بەرەو پێشەوە چووەو بووەتە ئەمرۆ و بەردەوام
رۆیشتن و ئەبێتە سبەی.. واتە زەمەنەکە دوێنێ و ئەمرۆی تیادا نییە بۆ مێژوو دانان ئەبێ..

من هەرگیز لە گەڵ ئەمەدا نیم کە شاعیر بێت و ئەو داستان و حیکایەت و ئەفسانانە وەکو چۆن
خۆیانن زیندوویان بکاتەوە لە شیعرەکانی، نەخێر، ئەمە رۆڵی ئەوانەیە کە فولکلۆر تۆمار ئەکەن، بەڵک
شاعیر ئەتوانێ سوود لەو شتانە وەربگرێ و بە رۆح و نەفەسێکی هاوچەرخی سەرکەوتو مامەڵەیان
لەگەڵدا بکات، ئەتوانی بیانکاتە رەمز، بیانکاتە حاڵەتێکی نوێ، نەك هەر ئەمە بەڵکو بە هەزارەها
ئەفسانەو داستانی جیهانی هەیە، ئەتوانێ بە شێوەیەکی هونەرمەندانە مامەڵەیان لە گەڵدا بکات
بلیمەتیو داهێنانی شاعیری رەسەن لەوەدا دەرئەکەوێ، کە چۆن ئەتوانێ بە دارشتنێکی نوێ، ب
بۆچوونێکی نوێ، ئەم شتانە بکاتە کەرەستەی شیعرەکانی، تەم و مژو ئاڵۆزیش دوور نییە ببن
گەیەنەرێکی کارامە، ئەگەر بێت و بە زۆرە ملێ نەکرێنە دیلی چوار چێوەی کارە هونەرییەکە.. واتە
ئەگەر هات و ئەمانە لە خۆیانەوە وە دەرکەوتن و توانییان لە دروست کردنی شێوە هونەرییەکە رۆڵێکو
کاریگەریان هەبێ، بوونیان لەو حاڵەتەدا پێویست ئەبێ، بەڵام پەنا بردنە بەر ئاڵۆزی و تەم و مژ
ئەنقەست و بەبێ ئەوەی پێویستیمان پێیان هەبێ ئەبێتە هۆی شێواندنی شیعرەکە بەگشتی و وێنە
هونەرییەکە بە تایبەتی، بەکار هێنانی شتی ئاڵۆزو گری گری و تەم و مژ بێ ئەوەی بزانرێ بۆچی بەکا
هێنراون و بۆچی بەم شێوەیە بەکارهاتوونە کارێکی هونەری نییەو نرخی کارە هونەرییەکە کە
ئەکاتەوە.. ئەو شاعیرەش کە ئەیەوێ بەم کارە ببێتە شاعیرو بناسرێ، هەرگیزاو هەرگیز ئەو ئاواتە
نایێتە دی و لە دواییشدا هیچی بۆ نامێنێتەوەو یارییەکەی روون و ئاشکرا ئەبێ و ئەکەوێتە بە
هەتاوی رۆژو داهێنان و رەسەنایەتی لە ئەنجامیشدا هیچمان لە هیچ.. واتە رەسەنایەتی و راستگۆیی
وریایی و دەربڕینی راستەقینە، ئائەمانە مەرجی سەرەکین بۆ سەرکەوتنی شاعیر، نەك پەنا بردنە بەد
خالف تعرف ـ ی عەرەبی کە رەنگە بەهۆیەوە بناسرێ بەڵام چۆن ناسینێك ؟ .

● شاعیر گەر بیەوێ لە سنوورە ناوچەبە تەسکە کە بچێتە دەرەوەو شیعرەکەی سیفەت
جیهانییەتی وەربگرێ پێویستە لە خۆیەوە دەستی پێ بکات، لەو شتە وردە بچکۆلانەدا دەستی پ
بکات... ئەبێ ئەوە بزانین کە میللەتانی جیهان بە گشتی لە زۆر مەسەلەو مەبەست و ئاوات هاوبەش
یەکترن، مەسەلەی ئازادی، سەربەستی، ئاشتی و برایەتی، خۆشی و ناخۆشی، ئازارو خەفەت
خۆشەویستی، ئەمانە بە گشتی لە لای هەموو میللەتێك هەنەو تیادا یەکن، شاعیر کاتێ شتێ

دەرئەبڕیٚو شیعرەکە بۆ خۆی شێوەی گشتی ی تیادا دیار بوو، ئەو کاتە شیعرەکە بە هۆی بڵاوکردنەوە ناوچە تەسکەکە ئەشکێنیٚ و ئەبێتە موڵکی خەڵقێکی زۆرو شاعیرەکە ئەناسریٚو خوێنەواریش بە دوای نووسینەکانیا ئەگەریٚ، جا ئیتر وردە وردە بە هۆی وەرگێرانەوە بەرەو وڵات و شوێنێکی تر ئەڕوات..
جیهانی یەتی شیعر بەوە نی یە شاعیرێك بێت و شیعرەکەی بە کۆمەڵە ناوو زاراوەیەکە بێگانە پڕ بکات و بڵێ ئەمە شیعرێکی جیهانی یە، بەڵێ شاعیر مافی خۆیەتی ئەگەر بیەویٚ دەربارەی هەر میللەتێك بدویٚ، مافی خۆیەتی و کەسیش ناتوانیٚ ئەمەی لیٚ بکاتە رەخنە ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەمە کارێکی زۆر چاکە، بەلاّم ئەمە جیهانی یەتی نی یە، چونکە ئەوە پیٚ ئەوتریٚ شیعری جیهانی کە شاعیر تیادا باسی هیچ کەسێك، میللەتێك، نەکردووە، کەچی هەموو کەس و میللەتێك ئەگریٚتەوە، باسی زەلامێکی ناکات، کەچی هەموو مرۆڤێك لەو پەڕی دونیاش بیٚ کاتیٚ ئەیخوێنێتەوە هەست ئەکا وێنەی خۆیی تێدایە ، کەڵە شاعیرانی جیهان بەوە بوونە جیهانی چونکە دەربارەی مرۆڤایەتی و دواڕۆژو بەختیاری مرۆڤ شیعریان نووسی، باسی هەژاری و دەربەدەری و ئازایەتی و مافی مرۆڤیان کردو بەرامبەر بە هەموو شتێك خاوەن ڕوانین و بۆچوون و هەڵویستی ڕاستەقینە بوون. ئەو شاعیرانە خۆیان بە واقیع. بەستەوەو لە پێناوی گۆڕین و پێشکەوتنی دا ڕەنج و ئازاریان نۆشی و تووشی هەزارویەك دەردە سەری بوون و بەلاتی و هەژاری ژیان، لێرەدا کە ئەڵێم واقیع منیش ڕام لە گەڵ ڕاکەی ڕوجێە گاروودی یە کە ئەڵیٚ: ( کە مرۆڤ واقیعی بیٚ، ئەوە ناگەیێنی کە بچیت و وێنەکانی واقیع وەکو خۆیان چۆنن بیانهێنیٚ، بەڵکو مانای ئەوەیە کە لاسایی جموجوڵەکانی واقیع بکاتەوە، ئەمەش ئەوە ناگەیێنیٚ کە بچێت بە هۆی کاغەزێکی زۆر تەنك دەقێك لەو واقیعە بهێنیٚ یان وێنەی بۆ بگریٚ.. بەڵکو ئەوە ئەگەیێنیٚ کە مرۆڤ بەشداری لە دروست بوونە مەزن و بڵندەکەی ئەو جیهانە بکات کە تا ئیستاکە لە قۆناغی دروست بوون دایە، ئەبیٚ هەوڵی ئەوەش بدات بە مەبەستی دۆزینەوەی ئیقاعەکانی. ).
● ئەوەی دوژمنی شاعیری داهێنەر داهێنان کوژ بیٚ، خۆ بەزل زانینە، هەست بە گەورەیی کردنە.. ستایشکردنی زاتە، داهێنەر لەبەر ئەوەی پڕەو بە زەمینەیەکی ڕۆشنبیری و هونەری بتەو پشتی قایمە، لەبەر ئەوە ئەوەی پیٚ بوتریٚ گەورەیی لە لایدا نابیٚ ببیٚ، چونکە خۆی گەورەیە، ئیتر چ پێویست بەوە ئەکات لووت بەرزو بەفیز بیٚ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەبینین مرۆڤێکی ڕۆح سووك و ئاسایی یە هەرگیزاو هەرگیز لە نرخی کەسانی تر کەم ناکاتەوەو بە چاوێکی پڕ فیز بۆ ئەدیبە گەنجەکان ناڕوانیٚ، چونکە بڕوای بە وەیە کە ئەم گەنجانە ئەبیٚ هانیان بدریٚ و دەستی یارمەتی یان بۆ درێژ بکریٚ بەوەی هەلیان بۆ برەخسێنریٚ بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان چونکە ئەمانە تەواو کەری ئەوەو ڕۆژیٚ لە ڕۆژان کەڵە شاعیرو داهێنەریان لیٚ پەیدا ئەبیٚ.. ئەمێنێتەوە مەسەلەی چاکی و خرابی بەرهەمەکە، بۆ ئەوەش دەبا خوێنەرو مێژوو ڕۆژگار بۆ خۆیان حەکەم بیٚ، ئەوەی باش و بەکەڵکە ئەمێنیٚ و جیٚ خۆی ئەگریٚ و ئەوەش کەڵکی نی یە دەڕوات و ڕێرەوی مێژوو پیٚ شێلی ئەکات.. کەواتە پێویستە بەم حاڵەتانەدا گەش بین بین و بە چاوێکی گەش بینەوە بۆ دواڕۆژی شیعرە ڕەسەنەکەمان بڕوانین و ڕیگەش بە ڕق و کینەو مەسەلەی کەسایەتی و خۆ خۆیی نەدەین ببنە کۆسپ و تەگەرە لە ڕیگەی بەرەو پێشەوە چوونی شیعری کوردی..

O

## تویشەبەرەی زاراوە

# سەرنیا و بەرنیا

رەئووف ئەحمەد ئالانی

مەزنترین و گەشەسەندووترین دیاردەی زمان لەجیهاندا، دۆخی (اضافة)یە. نەبێ خۆپێوە هەڵ کێشان هەڵکەوتی ئەودیاردەیە لەزمانی کوردیدا گەلێ لەبارترو چەسپیوتر بەچاو زمانە دراوسێ نزیکە نەژادو دوورە نەژادە کانیەوە. لێرەدا نەم گەرەکە بەتاو ڕستەسازی بەتانوپۆی بابەتەکەماندا بێمە خوارەوە؛ چونکە هەرێماو هەرێم ڕشتەی ئیزا جیاوازی تێدەکەوێ و، بەخەستی بابەتی کتێبێکی سەربەخۆیە. بالە پێشەوە زاراوەی ئە کەرەسەیە بگرینە بەرچاو: (١ ـ المضاف ٢ ـ المضاف اليه ٣ ـ علامة الاضافة ٤ ـ حالة الاضافة
بەرامبەرئەو زاراوانە برێك وشەی کوردیتاشی وەرگێڕراوی دەقی ئەوانە لە گۆڕێدار ئەوەش نێوقەدی کتێبەکان کەئەم بێژانەیان تێداجوونەوە:ـ

١ ـ تەواوکەر و تەواوکراو
٢ ـ دۆخی خستنەسەر
٣ ـ خراوەسەر
٤ ـ سەرخراو
٥ ـ دراوەپاڵ
٦ ـ درانەپاڵ... لەوانەشی سەیرتر ؟

بەش بەخۆم لاسایی ئەوبەرێزانەم نەکردووەتەوە.

وشەی پڕاوپڕیشی لەم دەیان ساڵەدا بەزەینمدا نەهات. زاراوە بێجگە کوردیە کا بەکارهێناون کرۆکی بابەتەکەم نەمراندووە.
لەم چەندانەدا وشەی )بەرەنیا، بۆلانیا) ی لەمەڕ ئاسنگەری، سرووشیان پێ بەخشی ئەوجا بەخۆڕا گوشینەوە بەخۆمدەگوت:
دەی باوان شێواو تێزەی بدەرێ و بی یان خەرەگەڕ!

خۆ (ئەحمەدی فەراهیدی)یش لەسنک پەتکی دەوارو زرمەکوتێی ئاسنگەرانەو، هەموزانست وزاراوەی (عروض)ی دانا. هیچ سڵی نەکردەو لە (لاشیپانە) بۆ نیوەبەیتو سە لە دەریاو لۆقەو سنگ وستون وشتیوانەکردەوە بەخوازە ـ دایبەزاندن. بەڵام ئـ شارەزاپانە بۆ مەسەلەکە چووبوو.

دەئەوجا بائێمەش لەودیاردەیەی (اضافة) بنۆڕین ولەمەڵبەندی خۆمانەوە زاراوەی بۆ سازبدەین. من وشەی (بەرەنیا)م هات بە زەینda. هەرچەندە فەرهەنگی خاڵو قامووسی زەبیحیم هەڵ پشکنینن. ئەموشەیەم بەرچاونەکەوت. بەڵامبەلای بابایەکی لادێیەوە یانئاسنگەرێکەوە شتێکی نامۆنیە وشەکە پێك هاتووە لە: (بەر + ە + نیا) واتە:

ئیزافەی پارچەسنێك بەجۆش بۆسەر کوڵە کاسنێك، یان بستە ئاشێك لەباری درێژیدا. هەروەها وشە ی (پۆلا + نیا) خستنە سەری نزیکە ئنیجێکی پۆلا لە پانیدا بۆسەر تەورو تەشوێ بەجۆشورەقانەوە.

لێرەدا ئیزافەی دوو هاوتوخمە بۆسەریە کدی. پاشگری «نیا» لەو دوو وشەیەدا بێجگەی مانای ئیزافە هیچیدی نادابەدەستەوە. هەرچەندە روخساری (نیا) بووەتە پاشگری هەندێ وشەی وەك (دڵ + نیا ـ ئاو + ە + نیا) ئەگەرچی ڕوخساری مۆرفێمەکە جیاوازینیە بەڵام لەم دوانەدا بۆ ئیزافەنیە. ئەگەر لە ریشەدا بچنەوەسەر بنیادێکی جیاواز، پێویستی بە لکۆڵینە وەیەکی دیهە یەو نامەوێ بە تاوی گریمانە ریسەی بدەمێ. ئەوەی کاری ئێرە مەیسەردەکا وشەی (بەرەنیا، پۆلانیا)یە.

با زەین بدەینە کوڵە گاسنێك لە خاڵی (ا ←) ەوە دەست پێدەکا وهەرلە ئاسن وپۆلا پارچەیەکە لە (← ب) وە دەخرێتەسەر . کەواتەبەشی «ا ←» (سەرە) یەو.

بەشی (← ب) (بەرە)یە و تەواوکەری یەکدین. ئەمەش دەق دۆخی ئیزافەیە. ئەوجا بالە باتی پارچەئاسنەلاوەکان، ناو، راناو بدرێنەدەم ناو.. هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێو باریرە وابنێژیش وەك گەلاوێژ دەدرەوشێتەوە. دیسان بۆ کارسووکی، بەزرەڕێژ قوناغێکیدی دەبڕین. لە (بەر ەنیا)دا بزوێنی «ە» بەندێکی فۆنێمی روونەو بۆ سواربوونی دووبرگەیە. ئەوجا لەسەر هاوکێشەی پۆلانیا، دڵنیا) لەرووی دەنگسازیەوە زاراوەکە لە رێژگەی (بەنیا)دا بخەینەکار. ئەوجا کەخاڵی (← ب) « بەرەنیا »بێ، رێگە سازدەکا بەشی «ا ←» ش «سەرنیا» بێ. لەئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەدائەم زاراوانە پێشنیازدەکەم:

١ ـ سەرنیا المضاف
٢ ـ بەرنیا المضاف الیه
٣ ـ نیشانەی بەرنیایی علامة الاضافة
٤ ـ دۆخی سەروبەرنیا حالة الاضافة.

بەشبەخۆم هەر ئەوەندەمتوانی کەلەپووری لێ بهێنمە زمان. ئەگەر زمانە وانێکی کەش باشتریسەرە و بەرەگرت ملیەی شانازیمە.

O

# شین و لاوانەوەی کوردی

■ دوکتور شوکریە رەسوڵ

شین و لاوانەوە یەکێکە لە هونەرەکانی شیعری ویژدانی. شاعیر یاخود لاوێنەر لە هەست و سۆزی تایبەتی خۆیەوە دایئەرێژێ بەرامبەر بە مردوو ئەکەوێتە گریان و وەسفی شاکارە جوانەکانی مردووەکە.

لاوانەوە لەسەر ئاوازێکی هێمن و دڵتەزێن و غەمبارانە دەوترێ*، ووشەو موفرەداتی سووك و ئاسانە. ناوەڕۆکی ئەو بابەتە باسی رابووردوو و وەسفی ئازایەتی و جوامێری و دەست رەنگینی و جوانی مردووەکە بە جوانترین شێوە ئەکات.

پەندێکی عەرەبی هەیە ئەڵێ:

« ئەوەی ئەمرۆ بۆی ئەلاوێنێتەوە، سبەینی بۆ ئەمیش ئەلاوێنرێتەوە».[1]

بەڵێ شین و لاوانەوە یەکسەر پەیوەندی بە مردنەوە هەیە، مرۆڤ بەرامبەر مردن و بیرکرنەوەی ئەم رووداوە ترسناکە کە ناوی مردنە ئەیخاتە بارێکی پڕ لە بیرکردنەوە و ترس و سامناکی و ئەگاتە ئەو قەناعەتە کە هەموو شتێك لەدونیا کۆتایی نەبوون و نەمانە. جا لێرەدا لاوێنەر یاخود شاعیر فرمێسك و بیرکردنەوەی تێکەڵاوی یەك ئەبن، هەرچی یادکردنەوەی خۆیەتی بەرامبەر بە مردووەکە دێتەوە یاد.

لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانیەت و فراوان بوونی بیری مرۆڤ شیعری لاونەوە پێشکەوت و شێوەیەکی هونەری جوانی گرتە خۆ.

شیعری لاوانەوە هەر لەکۆنەوە ئەکرێ بەدوو بەشەوە:ـ

١ ـ لاوانەوەی تایبەتی

٢ ـ لاوانەوەی گشتی *

لاوانەوەی تایبەت زیاتر کەسی نزیکی مردووکە ئەگرێتەوە وەك « دایك و باوك، منداڵ، خوشك و خێزان » ژن و مێرد ).

هەرچی لاوانەوەی گشتی یە «زمان ناسان و شاعیران هاوڕێیان و ناوداران ئەگرێتەوە.

جگە لەمانەش لاوانەوەی گشتی ئەشێ بۆ شارو گوندو کۆچ و کوچبارو نیشتمان بێ.

لەم بابەتانەدا لاوێنەر لە جوانی و نازداری مردووەکە و ئەو کەرەستانەی کە لەدوای خۆی

بەجێی هێشتوون هەرچی پەیوەندی بە لاوانەوەی تایبەتی یە ئەبینین لاوانەوە بۆ کوڕ یاخود پیاو هەر لەکۆنەوە تاکو ئێستا بەگشتی بەتینتر بووە. بە تایبەتی لاوانەوبۆبرا لەخوشك بەتین‌تر بووە. چونکە بارو دۆخی سەردەم زیاتر پێویستی بە برا بووە بە تایبەتی لەکاتی شەرو هێرش‌بردن و لەزۆر لایەنی‌تر کە ئافرەت لێی بێبەش بووە. * بەلام ژن ، ئافرەتی مێردکردوو ، ئەگەر هاتوو مێردەکەی شاعیر بوایە ئەوا بە شێوەیەکی تر حسابی بۆ کراوە. چونکە مێردکەی بە شێوەیەکی جوان فرمێسکی هەلچووی تێکەلاوی ووشەکانی ئەبوو، لەبەرئەوە نرخ و بەهای ئەزانی و دایکی منالانی بووە، یارمەتی دەری بووە لەخۆشی وناخۆشیدا. بۆیە مردنی ژنەکەی گەورەترین بۆشایی یە لەژیانیدا. بۆ نموونە: گلکۆی ئەحمەد بەگی کۆماسی و لاوانەوەی مەولەوی بۆ عەنبەر خاتوون کە بە جوانترین شیعری لاوانەوەی کوردی لە ئەدەبی دێرینی کوردیدا دائەنرێت. یەکێکی وەك مەولەوی مردنی خێزانی بە گەورەترین کۆسپ دائەنێ کە ژیانی لێ‌شێواوەو بلێسەی ئاگری یادی تەنهایی سووتاندویەتی و ئاخ و حەسرەتی جیابوونەوە لەخێزانی بە جۆرێکی لێ‌کردووە بووە بە قەقنەس‌و هەرشتێك ئەبینێ وێنەی عەنبەر خاتوونی دێتەوە یاد هەربۆیە بەشەو و بەرۆژ نوقرەی لێبراوە و هەموو کاتێکی لێ‌بووە بە مانگی موحەرەم. شیوەن‌وگریان و زاری بە رۆژی دەیەمی مانگی عاشورا کۆتایی نایە لەبەر جیابوونەوەی لە هاوسەرەکەی هەر بۆیە پەنا ئەباتە بەر مەی‌گێری فەلەك کە گیانی ئەمانەتی لێ وەوگرێ‌و ژیانی هەتا هەتایی پاش مردنی پێ ببەخشێ. وەك دەلێ:

شورای عاشوران دیسان بەزمش بەست

موحەرەم ئاما مەحرەم شی نەدەست

بازارەن وادەی مامەلەن ساقی

هەی بگرە فانی، وەی بدەر باقی

بۆی (عەنبەر) نەتۆی دەماغم دوور کەرد

فرسەتش ئاورد هەوای وەبای دەرد

هەرچی مەینۆن شێوەی تۆش پێشەن

دل وەهەتیتەی حەسرەتا کێشەن

هەر وەك روونمان کردەوە لە لاوانەی گشتی‌دا شاعیر یاخود لاوێنەر بۆ ناودارانو شاعیرانو برادەران ومێژوونووسان ئەلاوێنێتەوە. چونکە ئەمانە هەمیشە خزمەت گوزاری گەلو نیشتمانو دۆستو برادەرانیان بوونو رێزێکی تایبەتی‌یان لای شاعیران هەبووە. شاعیرانیش رایان وایە لاواندنەوە بۆ هاورێ‌و ناو ـ داران بە لاواندنەوەی تایبەتی دائەنرێت.

چونکە لەئەنجامی یەکتر ناسین و گوزەران کردن و دڵسۆزییان پێکەوە ئەگاتە پلەی خزمایەتی
لەبەر ئەوە لاوانەوە بۆ هاوری سۆزێکی راست و راستگۆییەوە هاتووە. زۆرجاریش تێکەڵ بە
شیعری غەزەل و ستایش و وەسف و پیاهەڵدان ئەبێت.

بەگشتی لاوانەوە وەك بەشێکی داب ونەریتی سامانی کەلەپوری نەتەوایەتی ئەکرێت بە
سێ بەشەوە:-

١ ـ شین و شەپۆرو لەخۆدان و هاوارکردن بەسەر مردووەکەدا.

٢ ـ پرسە (تەعزێ) دانان و قورئان و فاتیحە خوێندن.

٣ ـ رەش پۆشی: کەسوکاری نزیکی مردووەکە تا ماوەی ساڵێك یازیاتر رەش پۆش ئەبن.
بێگومان حاڵەتی یەکەم حاڵەتێکی ئیجگار کاریگەرە. ئەو کاتەی شاعیر هەوا
مردووەکەی ئەبیستێ خەمێکی قوول دای ئەگرێ و کەسی نزیکی مردووەکە قورپێوان
شیوەنێکی گەرم دائەمەزرێنێت و ئاگای لە هیچ شتێك نامێنێ، تەنها ئاگای لەو ئازار
دەروونیەی خۆیەتی کە پێوەی ئەناڵێت.

بەڵێ ئەم شیوەن و خۆکوشتنە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر ئەگۆرێت. لە هەند
ناوچەدا ئافرەتان دادەنیش و بەسەر سەرانی خۆیاندا ئەکێشن.
بە کوڵ ئەگرین و ئەلاوێننەوە. لە هەندێ ناوچەی تردا ئافرەتان بە زنجیرە ریز ئەبن
شیوەن ئەکەن:

سەرتاپایان لە قور هەڵئەکێشن و پرچی خۆیان بە هەردوو دەستیان دەرنن و لە دەستی
کلافەی ئەکەن. جۆرێکی واش بە ناو چەوانی خۆیاندا ئەکێشن هەندێ جار بە گۆنایاندا خوێ
رێچکە دەبەستێت یان کراسیان دائەدرن و بە هەردوو دەست بەسنگی خۆیان ئەکێشن، یان د
بە دوو بەرامبەر یەکتری رائەوەستن و دەست ئەکەن بەپرچ رنین و خۆکوشتن و هاوار کرد
لەگەڵ ئەم شیوەنەشدا ئاکاری چاکەی مردووەکە ئەڵێنەوە.

حاڵەتی دووەم پرسەیە ئەم حاڵەتەش لە یەکەم هێمن ترە بەهۆی هاتوو چۆکردنی خز
ناسیاو دڵخۆشی دانەوەیان.

حاڵەتی سێیەم رەش پۆشینە واتە تاماوەی ساڵێك یا زیاتر کەسی مردووەکە جلی رە
لەبەر ئەکات لەکۆنا کەسوو خزمانی مردووەکە ئەچوون بۆ لای خومچی و جلیان رەش ئەکرد
شایانی باسە لە ئەدەبی فولکلۆردا و لە کۆری شین و پرسەدا ژنان کۆرگەرم ئەکەن
ئەلاوێننەوە

ـ ئاشکرایە لاوانەوە لە ئەدەبی نووسراو ئەدەبی فولکلۆریدا ئەکرێ بەم بەشانەوە:-

١ ـ لاوانەوەی پیاو کە ئەویش ئەبێت:-

أـ لاوانەوە بۆ لاو یاخود گەنج

ب ـ لاوانەوە بۆ پیران

٢ ـ لاوانەوەی ئافرەت (ژنان) ئەمیش ئەبێت :-

أ ـ لاوانەوە بۆ گەنج یا شوونەکردوو

ب ـ لاوانەوە بۆ پیرەژن.

٣ ـ لاوانە وەی منداڵ.

٤ ـ کۆتەڵ

٥ ـ لاوانەوە بۆ شارو گوندو نیشتمان.

ئەگەر نموونە لە شیعری لاوانەوە چ بەسەر زاری خەڵکەوە بێ یاخود لە دیوانی شاعیراندا بێ ئەوە بە کتێبێکی قەوارە گەورە تەواو نابێ. هەر بۆیە ئەم نموونە و لێکۆڵینە. وەیەم وەك پێویستی لێرەدا نەخستۆتە روو و لە دەرفەتێکی تردا و خوا یاربێ لە کتێبێکدا سەربەخۆ ئەکەوێتە بەرچاو.

○

پەراوێزەکان

* ئەم بابەتەم بۆیە هەڵبژارد چونکە وەك داخ لەدڵێك هەمیشەو هەردەم لەبەر خۆمەوە تەسکینی دڵم بە بەیتی لاوانەوە ئەدەمەوە کە تاکو ئێستا نەمتوانیوە شیعرێ یاخود نووسینێکی وا بنووسم تەسەلا بە دڵم بێت و ئازاری پەنگ خواردووم کەم کاتەوە بەهۆی کۆچ کردنی نزیك ترین کەسی ناو خێزانەکەم.

١ ـ مظفر عبدالستار غانم / الرثاء في شعر العصر العباسي الاول. بغداد ١٩٨٤ . ص١١٢.

* دەربارەی ئەم بابەتە بە دوورو درێژی لە نووسینێکیدا بەنموونەوە هەردوو بابەتەکەم باس کردووە وچاوەروانی بڵاوکردنەوەیم.

٢ ـ لە ئەدەبی عەرەبیدا خەنسای شاعیر جوانترین لاوانەوەی لە وەسفی براکەی (صخر) دا هۆنیووەتەوە کە ئەم نیوە بەیتانە نموونەیەکە لە وەسفی ئازایی براکەی:

«صخر والیمان بوو، سەیدمان بوو»

(صخر) خۆی پێشەواو پێشرەو بوو.

یاخود شاعیری بەناو بانگی عەرەب (مهلهل) براکەی ئەلاوێنێتەوە کە (کلیب) ی ناو بوو و ئەڵێ:-

«من بانگم کردی ئەی کلیب وەڵامت نەبوو

ئەی چۆن خەڵکی دی وەڵامم ئەدەنەوە

# میجەرسۆن لە هەڵەبجە

وەرگێرانی : حسین احمد

لە ساڵی (١٩٣٦)دا ، کۆمەڵێ شیعری ناسکی تایەر بەگی جاف بەکوردیو فارسی لە شاری سلێمانی بەچاپ گەیشت . ئەم تایەر بەگە شاعیرێکی ناودار بەهرەمەندو خاون شۆرتە لە ناوچەی کوردستانی خوارووداا . جا لە چەند دێرەی لای خوارەوە ژیانو بەرهەمی ئەو شاعیرە کوردە ئەخەینە بەرتیشك کە لە پێشەکی یەکەی ئەو کۆمەڵ شیعرەدا وەرگیراوە ..کە دەڵێ :-

تاریەر بەگ ... شاعیری بەناوبانگی کورد .. شاعیرێکی شیرین کەلامو گوفتو لوفت جوان بووە .. ئەم زاتە کوری وەسمان پاشا کوری محمد پاشای جافە .. وەك زانراویشە بەگزادەی جاف چ وەك خانەدان ، چ وەك خێزانو چ وەك مروڤی ناسراو و ناودار لە ناو هەمو بەگزادە کوردەکاندا .. جێگەو رێگەیەکی هەرە دیاریان هەیە ئەمانە پتر لە (١٥٠)ساڵە .. سەر کردەی عێڵەکانی (جاف)ن جا لە سەر داواکاری پاشاکانی (بەبە) .. ئەم خێزانەو هۆزەکانی هاتنە ناوچەی شارەزوورو لەوێدا سەقام گیربوون ئینجا با بچینەوە سەر باسی ژیانی تایەر بەگ .. کە لە ساڵی (١٨٧٨)زاینی لە دایك بووەو ساڵی (١٩١٨) لەشاری سلێمانی کۆچی دوایی کردووە .. پاشان تەرمەکەیان گۆاستۆتەوە بۆ هەڵەبجەو لە گۆرستانی (عەبابەیلی) کە تەنها سەعاتە رێیەك بە پێ لەشاری هەڵەبجەوە دوورە نێژراوە تایەر لە قوتابخانەیەکی گەورەو بەناوبانگ نەخراوەتە بەر خوێندن بەڵام لە دەرچوانی قوتابخانەیەکی لادێی بچووك بووە ئەگەرچی .. زانستیو تێگەیشتنیو زانیاری گشتیو پایەبڵندیو زیرەکی ئەم زاتە ... دە چەندانەی خوێندنەکەی بووە .. تایەر بەگ بە چوار زمان هونراوەی هۆینوەتەوە واتە بە کوردیو عەرەبیو فارسیو تورکیو وستایانە توانیویەتی ووشەکانی ئەم چوار زمانە لە پارچە هۆنراوەی جوانو ناسکدا رێزبکات . هەرچەند هەوڵێکی زۆرماندا بۆ ئەوەی نوسخەیەکی ئەو کتیبەمان دەستکەوێ بەڵام بەداخەوە دەستمان نەکەوت . جا بەم بۆنەیە حەزئەکەم سوپاسی بێپایانی خۆم بۆ ناهیدە خانی خوشکی تایەر بەگ تۆمار بکەم کە لەم دواییەدا چەن پارچە شیعرێکی تایەر بەگی برای بۆ ناردین (پێشەکی کتیبێ ناوبراو) زیرەکی ئەم شاعیرە وەك سی . جی . ئیدموندز ئەڵێ لە گۆڤاری (جورنان اوف ذی رویال سینترال ئاسیان سوسایتی) ژمارەی مانگی ئوکتۆبەری ساڵی ١٩٣٦ لەم رووداوەی خوارەوە بۆ خوێنەری ئازیز دەردەکەوێ : پترلە (١٥)ساڵ پێش جەنگی جیهانی یەکەم ، [1] .

ﻪرسۆن گەشتێکی فراوانی بە کوردستان خوارووداکرد ... پاش ئەوەی چەن ساڵێکی بە گەشتەو گەڕیدەیی
ە سەر . ڕووی‌کردە دیوەخانی وەسمان پاشای جاف .. باوکی تایەر بەگ‌و وبووبە خزمەتکاری بۆ ماوەی شەشی
وت مانگێك لە ڕێژ ناوی (میرزا غولام حسین شیرازی) .. غوولام حسێن خزمەتکاریش بە ڕێك‌وپێکی
انەکانی بەجیٚ ئەهێنا ... بۆیە تایەر بەگ بە چاوی ڕێزو قەدرەوە تەماشای دەکردولەبەر چەن هۆیێکی تایبەتی
کەسایەتی‌و هەڵس‌و کەوتی ئەو نۆکەوە . کە لە ڕاستیدا جێگەی سەرنج بوون تا تایەر بەگ گۆمانی لیٚ پەیداکرد
جونکە گەلیٚ شتی سەیرو جیاوازی لە کەسایەتی ئەو (غولام حسین)ەی بەدی دەکرد .. کەلە گەلیٚ لە هەڵسی‌و
وتی خزمەتکانی تریدا بەدی نەدەکران ... وەك زیرەکی یەکی ئەوتۆو ئەدەبێکی زۆرو وریاییێکی تەواو وبیٚ
.ازە . جارێکیان تایەر بەگ خەرێکی خویندنەوەی پەرتوکێکی فەرنسایی بوو ، غولام حسین لیٚ‌ی
بکبووەوەو ووتی : قوربان .. ئەوە جەنابت فەرنسایی ئەزانیٚ ؟ لە وەرامدا تایەر گ ووتی : بەڵیٚ کەمێکی لیٚ
زانم . ئەی تۆ فەرنسایی ئەزانی ؟

ئەوەی تێك بچی یاخود دامێنی یەکسەر غولام حسین واتە (میجەرسون) پی‌ی ووت :—
شەش حەوت ساڵێك لەمەوپێش ئەمن خزمەتکاری کابرایەکی فەرنسایی بووم .. جا بە هۆی ئەو کابرایە فێری
بێ‌ی فەرنسایی بووم .
تایەر بەگیش کە ئەمەی زانی ناو بەناو بە فەرنسایی لە گەل (سۆن)دا دەمەتەقەی دەکرد بەتایبەتی گەر شتەکە
ی بوایە .
جارێکیان کە پێکەوە دەئاخافتن غولام حسین هەڵەیەکی لەدەم دەرچو . لە جیاتی بڵیٚ (نەأ) ووتی (نەو) کە
شەیەکی ئینگلیزیەو وواتای (نەیٚ) کوردی ئەبەخشیٚ کە تایەر بەگ ئەمەی لیٚ‌بیست نەختیٚ قیٚکچو ... جۆنکە
هەڵەیە گۆمانەکەی ساغ‌کردەوە ... کە ئەم (غولام حسین)ە بە نەژاد ئینگلیزە .. جونکە (نەو)ی‌بەکارهێنا لە
اتی (نەأ)ی کوردی .. ئەوجا تایەر بەگ (غولام حسین)ی بردە پەنایەکەوەو پی‌ی‌ووت : پێم بڵیٚ ناووت
ی‌یە ؟
ن : وەسیقەت‌بم .. چی‌یە مەبەستت لەم پرسیارە ؟ ناووم هەر ئەو ناوەیە کە دەیزانی‌و پیٚ گازم دەکەیت
ربەگ : نەخێر ئەوە ناوی ڕاستقینەی تۆ نیە ؟ تۆ ناوی خۆتت گۆڕیوە . . . تۆ کابرایەکی ئنگلیزیت سۆن :
ن زانیت ؟

تایەر بەگ : — لە شێوەی زمانەکەت ئەمەم بۆ ڕوون بووەوە
ۆن : بەڵیٚ وایە . ئەمن ئینگلیزم . ناوشیم سۆنە ئەمەش چەن ساڵێکە خەرێکی گەریدەیم لە نیوان عیراق و
ران‌و تورکیا .

کە ئەمەی لا بە تەواوی ساغبووەوە . . تایەر بەگ پی‌ی‌گوت : نابیٚ لەمە زیاتر لێرە بمێنتەوە ئەگینا توشی
ردەسەری دێیت بەدەست فەرمانڕەواي تورکەکاندا .

دوای ئاشکرابوونی ناسەکەی لەلای تایەر بەگ ، میجەر سۆن خێرا ماڵ‌ئاواي لێکردن . لەپاشا باسی

رخواستی ئەو سەردمەی لە کتێبەکەی (گەشتی کابرایەکی نیقابۆش لە میزۆپۆتمیا) لەو کتیبەدا کردووەو ..
ستاییشی (تایەر بەگ) وەك مرۆڤێ زیرەكو وریاو داناو دنیادیرە . دەکا .

جا لە هەموی خۆشترئەو لاپرانەیە لەو کتێبەی (سون)دا کە باسی سەردەمی مانەوەی خۆی لە شاری هەڵە
دەکات . . ئەو شارە جوانو ضنجلانەیە کە ئەکەوێتە خوارووی ڕۆژهەلاتی دەشتی شارەزوورەوەو لە سیبە
زەنجیرەی شاخە سەختەکانی هەورامان پاڵی داوەتەوە .

ساڵی (۱۹۰۹) خولیای گەریدەي کەوتە سەر (سۆن) بێ ئەوەی هیچ جۆرە نەخشەیەکی تایبەتی دانێ بۆ
مەبەستە . ئەوە بوو کە (سۆن) ڕێی کەوتە (ئەستەمول)و لەوێش بە ڕیکەوت وەك خۆی ئەڵێ . . بەتێم
وجاغزادەیەکی کورد . لەو شارە ئەگات کە بە (شێخو الاسلامي) سنە . . . ناسراو دەبێ . . . ئەو وجاغز
کوردە . . خولیای گەشتەکەی کوردستانی خواروی خستە سەر بۆیە ئەمیش یەکراس دوای ز
چاوپێکەوتنە . خۆی بەرەو کوردستان بیگرە هاتم . . بێ ئەوەی ناوە فارسییەکەی واتە (غولام حـ
شیرازی) بگۆڕێتو بەرێێ بیروت . حلب . دیار بکر . موسل . هە ولێر . کرکوك . . ئەوجا بو سیا
ئەکەوێتە ڕێ . لە سلێمانیش لەگەل (متی) ناوێکی . فەڵەی بازگانی خەڵکی موسل ئەبێتە هاورێ . تەنها چوار
لە شار ئەمێنیتەوە ئەوجا بەرەو هەلەبجە مل ئەنێ کە ئەو سەردەمە بە ناو لە ژێر دەستەڵاتی عوسمان پاشای جـ
ئەبێ بەلام لە ڕاستیدا خانم) خیزانی جلەوی هەمو شتێکی بەدەست بوو .

سۆنیش بە پەی نەریتو ڕەفتاری خەڵکی ناوچەکە . . ئازایانە ڕوو ئەکاتە دیواخانی تایەر بەگ . . . کـ
گەورەگەی (عادیلە) خانم . . لەوێش وەك بازرگانێکی فارسی بەناوی (غولام حسین شیرازی) خۆیبە بەگزادە
دەناسێی . ئەوجا بە پیی بڕیاری عادیلە خانم خۆی . . لە نهومی سەرەوە . . واتەلە لای کورەکەی تایەر بە
جیی بۆ دەکەنەوە . . هەرچەندە پاشی ماوەیەك دەگوێزرێتەوە بۆ ژوورێك لە ژوورەکانی خانم خۆی کە لە پا
کردیە سکرتیری تایبەتی خۆی .

ئەوەی ڕاستیبێ ئێمە لە کتیبەکەی سۆندا - وەك ئەدمۆندز - ئەڵێ هیچ جۆرە باسێك لە بارەی دەرکەو
پێناسە ڕاستەقینەکەی سۆنو بەدەرخستنی لە لابەن تایەر بەگەوە .
- بەدی ناکەین هەرچەندە باس لەوە دەکات کە هەمویان بە تایبەتی خانم خۆی زۆر حەزی لە مانەوەی دە
وەك مامۆستای زمانی فارسی بۆ هەردوو کورەکەی واتەبۆ تایەر بەگو احمد بەگ و هەمو جۆرە تەگەرەیەکیـ
دەخستەرێی ڕویشتنی بەڵام سون خۆی زۆر ڕازا بوو و ترسی لەوەش هەبو کە توشی تەنگەو چەڵەو دەردیسەر
بێت بە دەست کاربەدەستەکانی میری عوسمانیەکانەوە . . بە تایبەتی زەنەقی لە نوێ موسلمانیکی بە نەژاد (ئەڵەما
چووبوو کە ناوی (ئەمین ئەفەندی) دەبێ ئەم ئەمین ئەفەندیە کە وەزیفەی ڕاوێژکەری بزیشکی هەبوو لە کۆشك
تەلاری خانمو خیزانەکەیدا . . زۆر زۆر ڤیفیلە (سون) هەڵسابو . . جونکە لەو دەترسا کە ئەم فارسە کەچە

سالێکی لە ئەوروپادا بردۆتەسەر .. ڕەنگە ئەویش بێتە مەیدانەوە و ئیدعای پزیشکی بکاتو ئاوەکە لە ئەو لێڵ بکاتو جێگەی بگرێتەوە .. بۆیە هەمیشە خەریکی پیلان گێران بوو بۆ ئەوی تایەر بەگو خێزانەکەی لێ بە گومان بن و نەبێتە جێگەی باوەڕیان .. بەڵام هۆی ئەو پیلانانەی (ئەمین ئەفەندی)ە تەنها مەبەستیان مانەوەی سۆنو ئیشکەی بوون نەك ڕەگەزو ئاینەکەی.

دووەم هۆی ڕۆیشتنی (سۆن) ئەم دەنگو باسانە کە لە بارەی گەیشتنی (شیخ والاسلامی) سنە بوون بۆ یارە . کە تەنها (١٠) میلێك لە هەلەبجەوە دوورە ...

سۆنیش وەك لە پێشدا باسمان لێوەکرد لە (ئەستەمولّ) بە خزمەتی ئەو شێخە پایەبەدزە گەیشتبوو لەوەش دەترسا کە ئەو شێخە بێتو نهێنیەکەی سۆن لە ناوخەلکدا ئاشکرا بکاتو ڕەتی ئیدیعاکانی بکات وەك ئەرێدەیەکی نوێ موسلمان چونکە کە لە ئەستەمولّ چاوی پێکەوت لەو ڕایە نەبوو کە (سۆن) ئینگلیزە .. هەرچەندە .. سۆن خۆی ئەو مەسەلەیەی بۆ ئاشکراکرد . هەر یەکسەر دوای ڕویشتنی (سۆن) (شیخو الاسلامی) سنە گەیشتە هەلەبجەو لە دیواخانەکەی عادیلە خانمو لە پێش خەلکێکی زۆردا ئەوەی ئاشکراکرد کە دەمێکە دەستی بەوە کردووە . کە (گاوێك) لەو دیواخانە پاکەدا جی گیربووە . بەڵام بەپێی ڕاپۆرتەکەی (حەمە) کۆنە خزمەتکارەکەی سۆن لە هەلەبجە کە لە دیواخانە کە ئامادەبوو لە کاتی گەیشتنی (شیخو الاسلامی) سنە . خانمو تایەر بەگی کوری ئاکۆکی‌یەکی زۆریان لە (سۆن) کردو پەنجەیان بۆ شێوە زمانی شیرازبە پاکەکەی ڕاکێشا هەروەهاش باسیان لە ئەوەش کردبوو کە (سون) وەك موسلمانێك سەری دەچو بەڵام نوێژی نەدەچو.

سۆن سەرگوزشتەی ئەم ڕووداوانەی لای (متی) ناوێکی فەلەی خەلکی موسل باسکردبوو .

جارێکیان نوسەری ئەم باسە واتە (سی جی ئیدمۆندز لە عادیلە خانی پرسی بوو : ئایا هیچ گومانێکت پەیدا کردبوو بەرامبەر بە (سۆن) لە کاتی مانەوەیدا لە لاتان لە شاری هەلەبجە ؟

لە وەڵامدا خانم ووتی : بێ قەزا بێ چۆن .. جارێکیان تایەری کورم هاتە لام ووتی : - دایەگیان .. ئەمن لەم وڵام حسێنی شیرازیە زۆر بە گومانمو دلنیاشم کە ئەم کابرایە .. خەلکی ئەوروپایە ؟

منیش بە تایەری کورمم گوت : - ڕۆلەی شیرینم ئەم کابرایە میوانی ئێمەیەو ناشێ ئێمە خۆمان بخەینە ئەو جۆرە مەسەلانەی کە هیچ جورە پەیوەندیەکیان پێمانەوە .. نیە ؟

بەهەرحاڵ - وەك ئیدمۆندز ئەلێ توانای نواندنی (سۆن) لەو سەرەمەدا زۆر بەهێز بووە .. هەرەچەند زۆری خایاندو بەزیرەکی و زیتەلیو ووریای تایەر بەگی جاف پێناسە ڕاستە قینەکەی (سۆن) دۆزرایەوەو ئاشکراکرا .

سەرچاوەکان : -

١ - ئەم باسەم لە گۆڤاری (Journal Of The Royal)
(Central Asian Society)
(Part - 2 - Octobreh 1936)

وەرگێڕاوەتەوە .
ڕاوێژەکان
- وەرگێری ئەم باسە

# رشتەی ناوەرۆك
# لە هۆنراوەی کامەران دا

ساجد ئاوارە

١ – دەروازەی بۆچوون

لە بەر ئەوەی کامەران . لە هەرەتی دەربڕینی هەستو نەستە بەگوڕەکەی خۆی . بە شیعرو چیرۆك پڕا . ئەم
لە کاتێکدا بوو . پەیوەندی گیانی بە گیانیشی هەبووە بە ئێشو ئازاری نەتەوەکەیەوە پەلیشی بۆ هەموو ئە
میللەتانەش کێشاوە کە لە کۆڕی خەبات کردن دا بوون . بۆ سەرفرازیو ئاواتو ئامانجیان . پشتگیری بەتین
بزوتنە کردووە ئەم هەڵوێستەی بەڵگەی ئەوەیە کە لەناو کۆڕی ئەدیبانی کورددا . بە رەمزی شاعیرێکی نوێ خواز
شۆرش گێڕ ـ پایەی بڵندو شکۆداری بدرێتێ . . . . . !

لە لایەکی تریشەوە کامەران بە کەفو کوڵی دەروونە هەڵچووەکەی هۆشیارانەو بە دەما
بەرزیی‌یەوە – انفعال – ڕووی لە ئاسۆی ڕووناکی ئازادی خوازیو نوێکردنەوەی شیعری کردووە . دەبینین ئە
کامەرانە لە گۆڕەپاندا بەتواناوە خۆی بەهرەوەر پیشان داوە . لەبەر نەوەیە دەبێ ئەو دەورە مەزنەی هەبووبێ . .
کەواتە ئەویش لە جووڵانەوەی نوێخوازی لە شیعری کوردی‌دا بەشدار بووە . وەك گوڵێکی ناو چەپکە گو
گەشاوەو بۆن دارەکەی کاروانی شیعری نوێی کوردی . بە شانازی‌یەوە خۆی لە مێژووی ئەدەبی کورد
بدۆزێتەوە . . !

ئەم کامەرانەش چەند جۆرە بەهرەی پیوەیەوە دیاری دابوو ... ! دەبینین ، نیشتمان پەروەرێکی بەئاگاو هۆشیار بووە ، شیعری بەرزو بەتامو چەژی هەبوو ، هەروەها ئەکتەرێکی بلیمەتی سەرشانۆبوو ، ..دیسانەوە خەتیبێکی دەنگ زولاڵی بێهاوتابوو ، هەمیشە شیعرو ئەدەبیاتی نەتەوەکانی تری ، وەك وانەی پێویستی ، رۆژانە دەیخوێندنەوە ، .... !

کامەران ئاوەها ، بەم شێوەیە هاتە مەیدانی ئەدەبی کوردی‌یەوە ، .... ! دەپرسین :
ئایا دەبێ بارودۆخی سەردەمی کامەران ختووکەی دابێ‌و هاندەرو چاوساغی بووبێ‌و ئا ئەو کامەرانەی وەك رۆڤێکی کارامە پی‌ی گەیاندبێ .... ؟

. . . . .

## ٢ – کات‌و زەمینەی کار تی‌کردن

کاتێ بەرەی میللەتانی جیهان شکستی بە ، فاشیزم هێنا ، کە دوژمن بە هەموو نەتەوەکان بوو ، ئەو بەرەیە ەرکەوتنی بەدی هێناو گزنگی رووناکی بەیانی ژیان دەرکەوت ، بیرو باوەڕی دیموکراسی‌و سوشیالیستی نیەوەو ،بووە وێردی سەر زاری ئەو نەتەوە ماف خوراوانەی سەرزەمین‌و ئەوەی مافی زەوت کرابوو ، دووی ارەنووسی خۆی کەوت‌و ، ئەوەی ژێر دەستەی ئیمپریالیزمی سەرمایەداری بوو ، کەوتە خەبات‌و تی‌کۆشان‌و ۆرش هەڵگیرسان ، تا سەربەستی بۆ میللەتان رەخساو ، ئەم دیاردیەش بە تایبەتی لە عیراقدا ئاسۆیەکی رۆشن و ، هەموو بارێکی ژیانی گەلی عیراق گرتەوە ، وەکو : –

- بارو دۆخی رامیاری
- بارو دۆخی کۆمەڵایەتی
- بارو دۆخی رۆشنبیری

گۆمی مەنگی ژیانی کوردەواری بەم کارە شڵەقاو کانیاوی خاوێنیشی تێدا نەقیەوەو باری رۆشنبیریەکەی ، یبەتی (ئەدەبەکەی) کەوتە بەر ئەزموونێکی نوێ خوازی‌یەوە ، هەنگاوی بەرەو پێش چوونی ، دڵخۆشکەرەو ێی رەزامەندی ئەگەر هات‌و لەوکاتەی کە شاعیری بەهرەوەری خۆشەویستمان ، سەری هەڵدا ، دەست بە دووانی بکەین ، دەبێ جارێ ئەو هەڵ‌و مەرجانەی کە کامەرانی کردە شاعیر ، کات‌و زەمینەکەی دەست ان بکەین .

١ – سوپای شومی زەبرو زەنگی دەسەڵاتی فاشیزم لە ساڵی ١٩٤٥ دا شکستی هاتو ئەو مۆتەکە ترسنا سامداره ،قورساییەکەی لەسەر دڵی میللەتا لابرا .. !
٢ – ئەنجامی نەمانی فاشیزم ، دەرکەوتنی ڕۆژی ڕووناکی ڕژێمی سوشیالیستی بوو ، هەندێ لە میللەتان پێ سەرفراز بوو ، سوودیش بۆ زوربەی نەتەوەی دیکەش هەبوو .. !
٣ – ئەو میللەتانەی کە ژێر دەست بوون گیانی زیندووی ئازادیخوازیو ڕزگار بوونیان تیێدا بزواو دەریش کەوت زۆری ئەو نەتەوانەش بەرهەمی سەر فرازی‌یان چەشت .. !
٤ – چینی کرێکاری ناو ئەو وڵاتە سەرمایە دارانە خۆیان یەك خستو دروشمی نەهێشتنی چەوساوە هەڵگرتو کەمێ لەو چینە بە هەندێ لە مافەکانی خۆیان گەیشتنو هەندێکیش دەسەڵاتیان گرتە دەستو ب کۆمەڵگای سوشیالیستی‌یان دانا .. !
٥ – وڵاتی عیراق ، دەسەڵاتی ئیمپریالیستی ئینگلیزی لەسەربوو ، بەپێی بەرژەوەندی خۆی فەر هەڵدەسووراند ، هەرچەندە بە ناو فەرمان ڕەوایی پاشایەتی ئەم عیراقەی دەبرد بەڕێوە ، بەڵام ئەو ڕژێم ڕەسەن نوێنەری راستەقینەی چینە تەبع گیا کەڵەکان (دەرەبەگو بورژوای کۆمبرادۆرو کۆنە پەرست) بوو ، ر ئابووریان ، لەهەناوی عیراقدا قەوی‌بوو ، ئەم چینانەو ئیمپریالیزمی ئاغایان لە کاری جهانی هەڵمەتی لا شەپۆلاویەکەی ئازادیخوازی ناو میللەتان ترسان لەوەی کە گەلی چەوساوەی عیراقیش بگرێتەوە ، تەدبیری ئەو کرد ، دەیانزانی نۆرەی بیروڕای نوێی سەردەمی میللەتانو سەرچاوەکەی ڕۆشنبیری پێشکەوتووخواز ، بیرو ب پتەو دەکات ، نەتەوەی چەوساوە ژیرو بە ئاگا دەکات ، بە پلانەوە هاتنو بەزەبری تۆقاندنو گرتنو سزادانو کردنەوە ئەو بیرو باوەڕانەیان لە میللەت بەناوی پاساوە قەدەغە کرد ، بۆیەکا کە مێژووی گیانی نیشتمان پەرو کوردو عەرەبی ئەو سەردەمە دەخوێنینەوە بەرامبەر بەو کارە نارەوایە چەند جارێك ڕاچەنینو ڕاپەر خۆپیشاندانیان کرد مانیان گرتو دەستەو یەخە بوونو بەربەرەکانیان لەگەڵ ڕژێمی ئەوسای پاشایەتی بەرپا

٦ – ڕژێمی (ئێران)یش ئا لەو کاتەو سەردەمەدا باری لەنگ بوو بە دەست ڕاچەنینی نەتەوەکانی ئێرانو چەوساوەکانیەوە ، ئەویش لەو کاتە داخ لە دڵانە ، بە ئاگرو ئاسن بە قورقشمو پۆڵا . وەك دوژمنی ناقۆڵا ک بگرەو بکوژو وێران کاریو ڕاونانو تۆقاندنو بەندکردنو خنکاندن ، بەشێوەیەکی تایبەتی هاتنە وێزەی نەتە کوردی قارەمان ، .. ئازادیخوازانو خەبات گێڕە کوردەکانیش شۆڕشیان دژی ڕژێمی ئێران بەرپاکردو کۆم (مەهابادی نەمری) پێ لە دایك بوو ... !

٧ – لە عیراقدا کرێکاران نەقابەی خۆیان پێك هێنا ، جووتیاران کۆمەڵەی خۆیان درووست کرد قوت ڕێکخراوەی خۆیان وەدی هێنا ، لاوان یەکێتی خۆیانیان ڕەخساند .. ! هەروەها ئافرەتانو کۆمە تریش ... ! کوردیش کە خاوەنی هەڵوێست بوو لەم کارانە بێ بەش نەبوو ، ؟ئەویش وەك نەتەوە ، درو برایەتی کوردو عەرەبی ڕزگاری خوازو پێشکەوتن خوازی هەڵگرتو داوای خود موختاری خۆی کردە سەرم سەرەکی دروشمەکانی ئەوەبوو گۆڤاری (گەلاوێژ ،) لەو سەردەمە دەرفەتێك بوو بۆ ئەدیبو ڕۆش هونەرمەندانی کورد کە دەنگی خۆیان تیاییدا دەرخەن ... !

هەستی گەرمو گوڕی ڕاپەڕاندنی گیانی شۆڕش گێڕی سەر لە نوێ لە ناو بەرەو کۆمەڵانی کورددا ، لە عیراقدا بووژایەوەو هەستایە سەرپێ

هەموو ئەو بارو دۆخانەی باسمان کردن ، کە چۆن کاریان کردە سەر ڕۆشنبیرانو ئەدیبانو هونەرمەندانو رامیارانی عیراق کارێکی سروشتیش بوو ، بۆ (کامەران)ی ڕۆشنبیر ، چونکە ختووکەی ئارەزووی بۆ دیتنو دیار کردنی ڕۆڵی خۆی بەواتا (دەوری) لە ناو تێکۆشەرو خەبات گێرانی عیراق ، بە تایبەتی لە ناو نەتەوەی کورددا ، وەك شاعیرو تێکۆشەرێکی رامیاری ، ئاوەها سیمای دەرکەوت ... !

ئەوا دەزانین ئەو چیرۆكو پەخشانانەی کە لەناو گۆڤاری (گەلاوێژ)دا ، بڵاوی کردوونەتەوە نووسینەکانی ناو ڕۆژنامەی (ژین)و چوارینەکانو شیعرەکانی ناو گۆڤاری (هیوا) (ڕۆژی نوێ) ئەم نووسینانەی ، بەڵگەی بۆ چوونمان دەداتەدەست

## ٣ - کامەرانو ساڵەکانی پەنجا

کە دەڵێین ساڵەکانی (پەنجا) کە هەرەتی ناوبانگ دەرکردنی کامەران بوو لە دونیای شیعری کوردیو ڕۆشنبیریو جموجووڵی پڕ لە فەری تری ناو کۆمەڵگای کوردەواری ... ئەو ساڵانەی پەنجا قۆناغێکی نوێ کۆمەڵگای کوردەواری ... ئەو ساڵانەی پەنجا قۆناغێکی نوێی گەلی عیراق بوو ، بۆ ڕەوکردنی کاروانی بەرەو ڕووناکی دونیای تازە ... ! گەلی عیراق دەیویست باوەڕە نوێکەی رووی دەمی بکاتە

١ - یاساکانی گۆڕان لە گێتیدا

٢ - زۆران بازی چینایەتی بۆ بەردەوام بوونی ڕووەو دونیای ئاسوودەگی بەختەوەر .

٣ - حەتمیەتی مێژوو بۆ پەرژەوەندی چینی ڕەنجدەرانو نەتەوە ژێر دەستەکان بوو ئەم بارو دۆخە نەك بارو دۆخێکی تایبەت بەسەر میللەتی عیراقەوە ، بەڵکو تەوژمێکی قوناخ گواستنەوە بوو ، ئەو قۆناغەش زۆری نەتەوەو کۆمەڵگای گێتی گرتەوە ... !

بەرەیەکی پێشکەوتووخواز لە شاعیرانو هونەرمەندانو ڕۆشنبیرانی پێك هات ، بەکاری چووڵانەوەی ئازادیخوازیو ئاشتی پەروەری لە جیهاندا ، جەمسەرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هۆشو زادەی بەشدار بوون لە کاروانی پێشکەوتووخوازیی ، لەعیراقدا .. ! ، (گۆرانی)ی مەزنو ئەوجا (کامەران) ڕۆشنبیری ئەو سەردەمە بوون ، بەشێك بوون لەو کاروانەی ڕووەو ئاسۆیەو هەرگیز ئەمانە لە بەرەی ڕۆشنبیرانی عیراق دابڕ نەبووبوونو دابڕ نەبوون ... !

(کامەران) قوتابیەکی زرنگی، ئەو بارو دۆخە بوو ئەوەندە بە توانا بوو بە خۆیدا دەپەرموویەوەو لە گەلْ جەماوەری گشت چینو بەرەی ناو شاری سلیمانی لە کاتی پێویست دا لەگەلْ خوێشاندەران دەدواو وەك خەتیبێکی لیْ هاتوو بە ناو بانگ‌بوو ، لە سەر شانۆ وەك ئەکتەرێکی قالْ بوو دەوری بالاَی لە شانۆگەری‌دا بە سەرکەوتوی دەدی ، لەبەر ئەم هەلْوێستانەی گرتووخانەکانی رامیاری ئەو سەردەمە قوتابخانەیەکی بەرز بوون بۆ پیْ گەیاندنی کادێری رۆشنبیر کەمو کووری لەو قوتابخانەدا (کامەران) ئاشنایەتی بەست ، لەگەلْ زۆری ئەو رۆشنبیرانەی کە پێشکەوتووخوازی گەلی عیراق بوون . ئالْو گۆری بیرو برواو تیێوری لە گەلْ داکردنو ئەوەندەی ترگیانی نیشتمان پەروەری لە دلْو مێشکی (کامەران) پتەوتر بوو ، وەك (تەفاعولێکی دیایلەکتیکی) رەنگیشی لە ناوەرۆکی شیعرەکانی (کامەران) دایەوە .

**٤ – ناوەرۆکی هەمەجۆر بۆ شیعرەکانی کامەران ، پێویست بوو**

ئەم بۆ چوونانە ، جغزو سنوور نەخشین ئەگەر هاتوو لە ناوەرۆکی هەندیْ لە شیعرەکانی کامەران‌دا ، تیێپەر بوونێك ، لە وجغزو نەخشانە بەدی بکەین ، زۆر سروشتی‌یە ، چونکە کورد وەك نەتەوەکانی تر ئەویش تایبەتیەتی خۆی هەیەو هەر دەشی‌مینیْو زۆریش رەوایە ... ! لە بەر ئەوەیە سەرجەمی شیعرەکانی (کامەران) بگرین ، دەبینین وەك چەپکە گولْ خۆی دەر دەخات ، هەر گولێکی ناو ئەو چەپکە بۆنو بەرامەیەك دەبەخشیْو بۆنەکان یەك لەیەك خۆشترنو دلْ دەکەنەوە مەبەستمان ناوەرۆکی شیعرەکانە ، کە زەمینەو کاتێکی تایبەتی ئەم گۆرەپانەی بۆ (کامەران) ساز کردو کە بارو دۆخێکی کوردستان بوو پێویست بوو ، بەو (واقیعەو تەتبیقە) ناوەرۆکی جۆراو جۆر ، بابەتی شیعری (کامەران) بن ،.کامەرانیش نکۆلی لی نەکردو ئەو بابەتانەی درکاند ... !

. . . .

**«هەندیْ لەو ناوەرۆکانە بە پەلْگەوە»**

١ – ناوەرۆکی مرۆڤایەتیو پێشکەوتوو خوازیی سەرنج لە دیوانەکانی کامەران بدەین دەبینین دەنگ‌و ئاوازی مرۆڤایەتیو پێشکەوتوو خوازیشی تیایاندا زولاَلەو ، وەکو چۆن هاتووەو شیعری (ئیلواری) کردووە بە کوردی

لە کۆرنیکانی وێرانا
لە ژێر شینایی ئاسمانا
رێبوارێك ملی ریْ ئەگریْ
وورد وورد ریْی ژیان ئەبریْ
بەرخۆلەیەك لە باوەشیا
کۆترێك لە دلیْ گەشبا
گۆرانیەك ئەلیْ ئازاد
بۆ گیانی گشت ئادەمیزاد
نەغمەی یاخی بوونیك خاوێن
گۆرانیەك بۆ هەموو شوێن

لەم شیعرەدا ناوەرۆك زەقە ، دیارە ، مەبەست گیانی مرۆڤایەیتە (بۆ ئازادی خوازانیش وەك شاعرێکی پێشکەوتووخواز دەڵێ : -

حاکم : - موتەهەم (جیمس ویلسن)

تەمەنت : - پەنجا ساڵ ئەبێ

ئیشت : - دەربەدەرو بێجێ

ئەم موحاکەمەیە دەست پێ دەکات تا (موودەعی عام دەڵێت) : -

ئەم درنجە گەورە رەشە
کۆمەڵی تاوانو خەشە
دڵی سیخناخ بووە لەژان
بەرامبەر پارە دارەکان
ئەوەندە بێ فەرە ئەڵێ
نابێ سپی بە من بڵێ
تۆ نوکەری وەرە سەر چۆك
بۆ دەولەمەندی نیویۆرك
ئەڵێ من رەنجی شانی خۆم
ئەبێ وەك ئینسان خۆم بخۆم

بۆ مرۆڤایەتیش ئەلێ :

ئەی کۆتری سپی ی جوانم
ئەی لەرەی لەحنی رەوانم
تۆ دۆستی گشت مناڵانی
رەش بێو سپی ، برایانی

. . .

کامەران رۆ دەچێتە ناو زامو ئازارو ژانەکانی گەلەکەیەوە بەو تاقی کردنەوەیە خۆی لە کێشەکانی خەباتو تێ کۆشانی نەتەوەکانی گێتی ی دەدۆزێتەوەو ئاوێتەی دەبێتو ئەویش دەنگ دەکاتو دژ بە چەوسانەوەو زەوت کردنی مافی میللەتان دەدوێ ، وەك ئازادی خواهێك بە ووشەی کوردی رەسەن دروشمی رزگار بوون دەهۆنێتەوەو ئازاری نەتەوەکەی ، وەك دروشمێك پێی بەرز دەکات هەر بۆ ئەوەشە کە کورد نابێ لە کاروانی ئازادی خوازانی هەندەران تەریك بوەستێو بەم کارەش (کامەران) نەمربێ بۆ شیعرەکانی مسۆگەر کرد .. !

٢ - ناوەرۆکی چینایەتی :-

ئەوە ئاشکرایە کامەران دژ بە دەرەبەگو چەوسانەوەو غەدر بووە ، بەرامبەر بەچینە هەژارەکانی ناو کۆمەڵو هەموو مرۆڤێکی بێ دەست ، چەکی بیر هەڵدەگرێو چینی دەرەبەگو چاو چنۆکی بۆرژوای کورد رێسوا دەکاتو وەك گیاکەلە تەماشایان دەکاتو بوونیان کۆسپە لە رێبازی خەباتی گەلەکەی .

چونکه به تاقی کردنەوه بۆی دەرکەوتووه کە زۆری شۆڕش و راچەنینەکانی گەلی کوردیی لە (ئێران)و جێگاکانی تر ، کە یەکە بە کەیان سەرکەوتوو نەبوون ، کەوتوون ، لە بەر هۆی زەبرو زەنگی دەرەبەگەکانو سەرۆك خێڵەکانو سەرمایەدارە گەورەکان ، کە دەوری فەرماندەیی کردنی ئەو شۆڕشانە کەوتبوونە ژێر دەستی ئەمانەوه ... ! دەبینین شاعیر زۆر جار باسی هەژاریو برسێتی کرێکارو جووتیار دەکاتو کە دێتەسەر ئاغاو میرو سولتان ، بەبێ ترسی ریسوایان دەکاتو دەڵێت : —

گوێم لە شریخەی لێدانی دارە
قامچی لە پشتی داغان بێزارە
کەمن دڵسۆزیم بۆ سزا دراو
چۆن بم بە قامچی بۆ ئەو زۆردارە
بۆ رەشو رووتوچینی برسی
هەر چییەك ئەکەی ناترسی
هەر یەك نۆخەی ، ئەم میللەتە
نادەم بە هەرچی‌یەك ، هەتە
هەر ئەوە بوو تاوانیمن
ووتم کەس مەکەن بە گاسن
هەژار مەکەن بە خشتو بەرد
بۆ کۆشکی بەرزی سوورو زەرد
گوێم لێتە لە ورشەی داسا
لە هۆرەی خاڵو هەباسا
جوتیار بۆ خۆتانە شارا
چرای خۆشیتان هەلکرا

. . . .

یا دەڵێت : —

ئەوی ئەم نانە دێنێتە بەرهەم
هەمیشە برسیو رووتو هەژارە
بەڵام دەوڵەمەند . بەجەورو ستەم
بوو بە خاوەنی ، سامانو یارە
وا دیارە یاسای ژین ، ئەمرۆ وابە
هەرکەس رەنج بدا ، رەنجی بەبایە

. . .

چاو ئەبڕێتە ڕەنجی هەژاریٚ
من لە تاو هەژار چاووم لێك نانیم
بۆیە چیت هەیە لە سامان بە جاریٚ
نرخی پووشێکی من بۆ دا نانێم ،

. . .

بنو لەسەر چەرپای ئاڵتون
لە تەلاری ڕەنگاو ڕەنگا
ئەم کۆمەڵە دڵدش مردوون
لە تاریکی شەوە زەنگا

۳ – ناوەڕۆکی نەتەوەیی و مرۆڤایەتی

کامەران بە بیروباوەڕ نەتەوە خوازێکی مرۆڤانە بوو ، هەموو شەقڵ و بابەت و ناوەڕۆك و شێوەی شیعری ئەوە دەسەلمێنی . کە کامەران مرۆڤێکی رامیار بوو . خەباتی بە باوەڕەوە کردو . ئەم هەڵویستەشی ، کردی بە شاعیر .. ! بەناوی جووتیارو کرێکارو ڕەش و ڕووتی نەتەوەکەی دەدووا . دەچوو بەگژ کۆنە پەرستان و ئەوانەش کە دژ بە مرۆڤایەتین و دژی نەتەوەی کوردیشن . هەژاران دەچەوسێنەوە . ئەم کردەوانەی بۆی بوونە هۆی ڕادوونانی لە لایەن میری کۆنە پەرستەوەو تەختی زیندانیان کردوو ماوەیەکی زۆر دوور خراوەو نان براویش بوو ... ! کامەران لێرەدا دەڵێت : —

ئەوەی مێژووی کورد بخوێنێتەوە
ئەڵقەی زنجیرەی بهونێتەوە
تێ دەگا هەرگیز سەر نانێتەوە
هیچ هێزێك نیە بیتوێنێتەوە
ئەو چەرخە نەما درەختی ڕەگەز
ڕیشەی دەرکێشن هی ئێمەی نەبەز

دیسان دەڵێت : —

بۆ تۆ ئاڵتون و تەلارو سامان
بۆ منیش ڕێگەی سەختی تێ کۆشان
تۆ بۆ خۆت ئەژیت بۆ خۆت ئەمری
من بۆ گەلی کورد – خاکی کوردستان

. . .

**٤ – ناوەرۆك (كەلەپووری نەتەوایەتی)**

**چەمكی – كەلەپوور ئەوەیە ، لە كۆی گشت ژیاری نەتەوەكانی سەر ئەم زەویە درووست بووە ، كەلەپووری كوردی لەپاشماوەكانی ژیاری میدیو لولوبی هاتووەو داستانەكانی میرنشینەكانەو بەیتی دلداران‌و ئەو پەندو باوە نەمرانەی دێرینەی كوردن‌و ئاوێتەی بەیتی شیعر دەكرێن ، هەر چامەیەكی كوردی ئاوێتەی كەلەپوور بووبێت ، وەستایانە بەكار هاتبێت ، دیارە ئەو چامەیە ، جووانكاری پێوەی دیارەو نەمرە ، بۆ نموونە ، ئەمە شیعرێكی كامەرانە كە ناوەرۆك ئاوێتەی هەندێ فۆلكلوری نەریتی میللی كوردی بووە**

داری شێخەباس سێبەری
بوو بە چەتری شێوە پەری
....

لەرەی (دەسمالێ) پوولەكە رێز
دلێ دلدار ئەكا بێ هێز
كچۆلەی بەژن‌و بالا بەرز
لەتریەی نەرمی (پانی بەرز)
وەكو نقامی (زورناژەن)
نەرم ئەلەریەوە ، بەدەن

سكفان عبدالحكيم

# تو بێژی راستە

ژانا و تێکەهشتی و شاسوارێن رەخنێ دبێژن.. دڤی چەرخیدا پیدڤی‌یە رەخنەگر رەوشەنبیربیت و هنەك خالێن هەین دڤێت چاڤدێریێ لێبکەت و یێ لێ ئاگەهدار بیت دا ئەو بەرهەمێ رەخنەگر ماڤێ خوٚ وەرگریت ژ سەنگاندنا بێ‌لا و بژوین و دا رەخنە لناڤ تورێ کوردیدا بێتە ئاڤاکرن سەر بنیاتەك راست و دروست و هەمی تورەڤان قازانج و مفایێ ژێ وەرگرن.

و هەکە رەخنەگر لدویف ڤان خالا نەچیت و خو پێڤە نەگریت بەرهەمێ وی قەت نکاریت جهێ خوٚ بکەت دناڤ دل و هزرێن خویندەڤانادا، چێدبیت نەئێتەخاندن ژی و ئەڤ رەنگێ نڤیسینێ زیانێ دگەهینتە کاروانێ ئەدەبێ کوردی یێ هەڤچەرخ و مینا مە گوتی پێدڤی‌یە رەخنەگری ئاگەهـ ژ ڤان خالا هەبیت و هایژێ هەبیت ب هویر کاتی دا نەکەڤیت چ داڤ و تەلها و دا بکاریت خو قورتال کەت ژ هەڤالینیێ و سەربەست بیت ژ بەندێن هوگریێ و دا یێ سەرفەراز بیت ب بریارێد خوٚدا هینکێ نا ترسیت و ناکەڤیتە تایێ شەرمێ.. و ئەڤ خالە ئەڤەنە

١ ـ سەنگاندنا بەرهەمێ ئەدەبی ژ لایێ هونەریڤە.

٢ ـ دیارکرنا بهایێ وی بدرستی

٣ ـ نرخێ وی و هەژیاتیا وی ژ لایێ هەست و ئاشکرا کرنێ.

٤ ـ دەست نیشان کرنا بەرهەمی د ناڤ نەخشێ رێبازا ئەدەبی.

٥ ـ دەست نیشان کرنا بەرهەمێ ئەدەبی هەکە نویکرن و ( ئیبداع )و داهینان هەبیت دا پاڤێنە سەر سامانێ ئەدەبی.

٦ ـ پیڤانا ئەگەرا ل دوور و بەر لێ کری و کا چەند ئەگەر لێ هاتیە کرن و وێنەگرتنا لایێن

خودانێ بەرهەمی و خالێت هەست و هزرا خویاکەن دگەل هاریکاربێت سایکلوژی دا رەخنەکر بکاریت چەند رێکا پشتی هینگێ بخو ب هەلبژێریت و دا ب هێز ورەشەنیر یەك گەش دەست پێیکەت دا چوجارا نە هلنگڤیت و پاش نەکە ڤیت.

و ئەو رێکێن زانایێن رەخنێ دیتین کو پێدڤی یە لدویف بچن ئەڤەنە.

١ ـ رێکا هونەری

٢ ـ رێکا دیروکی

٣ ـ رێکا سایکلوژی

و ئەڤ تیوەرێن رەخنێ هاتنە بجهـ ئینان پشتی گەلەك سەرهاتی و ( تطبيقات ) هاتینە کرن ل سەر گەلەك نڤیسینا یێن بناف و دەنگ ل روژهەلات و ئاڤاییێ ژ بەر هندێ ژبیرنەکرن لایێ سایکلوژی بکەنە شەنگەستەك ژبو ئاشکرنا و سەنگاندنا هەر بەرهەمەکی ئەدەبی و چ چیروك و رومان بیت یان هوزان و داستان بیت و ناڤێن مەزن هاتنە داتان دا لبەراهیکێ بەرهەمێن وان بکەڤنە بن تیروژکا رەخنەگرێ نوی و هیڤی و داخازا مەیە ئەم دنڤیسین وئاخفتنا خودا مفایێ ژ ڤان خالا وەرگرین و دا ئاوریەکێ بدەینە کەڤنە روژا دا بزانین پشتی مەزنێ رەخنێ ل جیهانێ ئەوژی (ئەرسطو ) بو دیڤرا (هوراس) هات دا پەرتوکا (ئەرسطو) شروڤەکەت د ناف هوزانا خودا بناڤێ پەرتوکا ئەرسطو دانا (هونەرێ هوزانێ) و من دڤێت بێژم پشتی ڤـان هەر دوو کەنکەنا (دانتی) هات دا ئەوژی گازییا خو راهێلید دەمێ بەرەڤانی ژ زمانێ نەتەوایەتی کر و دڤیا زمانێ مللی شینا زمانێ زانینا جیهانی بگریت ئەوژی (لاتینی بو) و گوتێ کـو ستران و کێشێت مللی بهایەك مەزن هەیە د دیروکا ئەدەبیدا و (دانتی) شیا درێکا داستانێن خـودا بەرفرەهێ بدەتە هزرا ئەرسطو ژ لایێ جفنکیێ ڤە (الرمز) ئەڤ سەرهاتییە من کرە گروڤە دا بێژم زمانێ مللی و نەتەوایەتی و کار و کریارێت هەر مللەتەکی پێنگاڤەکە ژ بو نافدارییا جیهانی و هەکە رەخنەگر هەمی گاڤا ڤێ هزرێ نە شارینید و نەئینتە بیرا مە ئەم دێ بەرەزەبین د ناف پێلێت بیانی و خویانی.. زمانێ مللی و نەتەوایـەتی و رویدانـێن مللەتی مینا دیـروکێ یان چیروکەکا راست نە بیتە پالڤەدان ژبو نڤیسەڤانی و هوزانڤانی پا تە چەوا دڤێت رەوشەنبیرەك جیهانی ژ نافمە دەرکەفیت و چ ژ خو و مللەتێ خو نەزانیت و بلا خو سەد خەلاتا وەرگریت و سەد زمانا ژی بزانیت. زمانێ مللی و نەتەوایەتی دێ مینت لدویماهیکێ چەکەك دژوار د دەستی دا دا رێکا خو بشەقینیت بو هەمی دونیایێ بناڤێ مللەتێ خو و بزمانێ مللەتێ خو... و ئەڤ ئاگەهدارییە پێدڤی یە ل بیرا مە بیت دا پاشەروژا مە گەشبیت.

○

■ سامي سليمان حاجي ■

**« کەریم جەمیل بیانی » شاعرو چیروکنڤیسێ گەنج دەنگەکە ژ دەنگێن مە ل ڤان سالێن دویماهیێ بسەر کەتو شیا جهێ خو بکەت ل پاناڤا ئەدەبێ ل دەڤەرێ... دەنگەکە نا نیتە ژبیر کرن دەمێ چیروکنڤیس و رەخنەگر دئێنە هژمارتن ب راستی ئەڤ [illegible] من نەجهێ ڤی باسی یە بەلێ دی ڤی باسی هێلم بو نڤیسینەکا دی یا بەرفرەهتر.**

وژبلی کومەلە چیروکا ئێکێ « داڤێن » کاك « بیانی » شیعرو چیروك و رەخنێن خو ل گەلەك [illegible] [illegible] بەلاڤ کرین.

[illegible] دزانت کو رێکا چاڤ لێ کرنێ ل نك نینە، بەلکی طاما داهینانێ هەر [illegible] رێکەکا تایبەتی بو خو بگریت و ل دویڤ بچت... هندەك هزرێن نوی ب کار [illegible] [illegible] ب کار ئینای (مستعمل) ب رێکەکا نوی وچارە سەرکرنەکا نوی بەرچاڤ [illegible] [illegible] ری.

[illegible] شرینی » نمونەیە بو ڤێ ئاخفتنێ.. هەکە مروڤ باش هێڤ کەتێ دێ زانت چەند هزرەکا پێشکەفتی یا ب کار ئینای تێدا... ژبەر هندێ ئەز دشێم بێژم کو نە ئینایە پێش نوکە، نە دچیروکادا و نەد شیعرادا.

« شرینی » پێنگافەك زیرەكو ژخوپشت راستە دجیهانا چیروكا مەیاكوردی داو ئەز دبێژم چ گومان تێدا نینە كە چیروكەكا سەركەفتیە ژ هەردوو لایێن روخسارو ناڤەروكێ ڤەو هزرەكا جوان هەلگرتیە،... هیڤیا مە ئەوە بو چیروكنڤیسی پێنگاڤێن فرێتر پاڤێتل سەر رێكا نڤیسینا كورتە چیروكێ.

هزرەكا هەی ل ناڤ مە كوردا دبێژن هەكو ئێك دمریت ئەوی ئاگەهـ ژوان مروڤا هەیە ئەوێن بو دكەنەگری د شونو ڤەدشێرن... ئاگەهـ ژوێ هەمێ هەیە بەلێ نەشێت باخڤت... تاكو دكەنە د گوری‌داو ئاخێ رادەنە سەرو ئەو مروڤ دێ رابن چنەمالٌ، ئەوژی - بێ‌مری - بێ ل وێ ئنیەتێ دێ دگەل وان چتە ڤە بەلێ سەرێ وی ڤ بەرێ ل هنداڤێ دكەڤت و ژنوی دزانت كو بێ مری... ئەڤە هزرەكە ئەز دبێژم گەلەك ژهەوە دزانن ئانژی بێ بهیستی.

هزرەكا دی یا هەی - چیروكنڤیسی یا بكار ئینای دچیروكاخودا - دبێژت روحا مروڤی پشتی مروڤ دمرت دەر دكەڤت و دئێتە جیهانا مە زێندیاو دچیتە هندەك جهێن تایبەتی ل هندەك دەمێن تایبەتی وەكی دێرا - ل نگ براییێن مە یێن فەلە - و گورستاناو هندە جارا ژی دئێتە خەونا مروڤی... خودانێ ڤێ روحێ وەسا دئێتە پێش چاڤێن مروڤی هەكو بەری مرنێ ئانكو خولكو دیمەنێ وی بێ وەسایە وەكی بەری بمریت... دڤێ چیروكێدا چنكی هەڤالێ قارەمانێ چیروكێ فەلەیە لەورا روحا وی یا هاتیە ددێرێ ڤەو چیروك لوێرێ دەست پێ دكەتو هەر لوێرێ بدویماهی دئێت وەكی مە دیتی دەمێ خواندنێ..

راستی ئەڤ هزرە رێكەكا نوی‌یە دچیروكا كوردی‌دا كەسێ - بهزرامن - بكار نەیئنایە بەری نڤیسەر چیروكنڤیسی دڤێت بومە چیروكا شرینیا « هرمز »ی بێژیت، بەلێ چەوا « هرمز » یێ شهید بوی - [illegible] شەرێ مە دگەل ئیرانێ... ل ڤێرە كی دێ بومە چیروكێ بێژت ؟... هەكە ل سەر ئەزمانێ قارەمانێ چیروكێ بێتە گوتن ئەز دبێژم دا چیروك گەلەكا سست بت چنكی هەر ئەوە كەسێ چیروكێ یێ بتنێ - شخصیة القصة الوحیدة - وخویشكا « هرمز »ی چ نەدزانی ژ هەڤالینیا هەردوكا دا بومە چیروكێ داریژت چنكی قارەمانێ چیروكێو « هرمز » بتنێ باش وان بیرهاتنا دزانن ویێن تێدا ژیاین.

ل ڤێرە دڤێت دووكەس هەبن ئانپتر دا وان هزرو بیرهاتنێن كەڤن دارێژن - وەكی دچیروكێدا هاتی -...

بەلێ چەوا ؟ قارەمانێ چیروكێ یێ بتنێ‌یەو « هرمز » یێ شهید بوی.... ؟ !

كاك « كەریم »ی ئەو هزرا بەری نهو من گوتی یا بكار ئینای بوڤێ مەبەستێ، روحا « هرمز »ی ئینا ئانژی هویێن ڤێ هاتنێ ئانین پێش چاڤ پاشی روحا شهیدي هاتو روینشتە خار دگەل قارەمانێ چیروكێو - ئەدویرە چیروكنڤیس بخو بت - چیروكا شرینێ ئەوا پشتی پازدە سالا گەهشتیە بنەجیهێ بو گوت، بەلێ پشتی چو شرینیا چ ؟

* * *

چیروك گرێدانەكا دو دەمایە، دەمێ بوری « زاروكینیێ » دگەل دەمێ نهو دەمێ گەنجاتیێ.. ئەڤ هەردوو دەمە بێت هاتینە بەستن ب شرینیێ ڤە، شرینیا دەمێ بەرێ یا جەژنا سەرێ سالێ‌و شرینیا دەمێ نهو، شرینیا بیرهاتنا شهیدبونێ...

ئەڤ‌شرینیە یا جەژنا سەرێ سالێ بو... سالا بەری پازدە سالا بو.. ئەرێ ما مە ژبیرکر « هرمز » فەلە بو ؟ ! بەلێ ئەڤ شرینیە نەگەهشتە بنەجیهێ ل وی دەمی چنکی رێبەرێ خاندنگەهێ نەهێلاو پشتی « هرمز » شهید بوی خویشکا وی - وەدیارە - هەر سال دا چت شەمالکا هلکەت و بیستەکی دگەل هزرێن خو ژیت و شرینیا بیرهاتنا سەری سالێ دانتە ددێرێ ڤەو نەدویرە ل دەروجیرانا ژی بەلاڤ کەت مانێ ل دەڤ مە ژی ئەم خێرا مریا ددەین و (سەدەقا) سەرێ کەس و مروڤێن خو ددەین و ئەز دبێژم مە هەمیا شەکروکێن خێرا یێن خارین ڤیجا نە تشتەکێ سەیرە ئان خەلەتە هەکە خویشکا « هرمز »ی شرینیا برایێ خو بدەت ! ! ! چیروکا « شرینی »یا بویە سێ پرت ئانژی یا دروست ئەو بێژم ئەم دشێین بکەینە سێ پرت... ، پرتا ئێکێ دەست پێ دکەت ژ سەرێ چیروکێ تاکو قارەمانێ چیروکێ دچیتە ددێرێ‌ڤەو ئەڤە نوینەریا دەمێ نهو دکەت.. پرتا دوێ دەست پێ دکەت هەکو روحا « هرمزی » دئێتە نگ قارەمانی تاکو درێژە بیرهاتنێن خو بدویما هیگ دئینن و روح دچت، ئەڤ بیرهاتنە کە چیروگ هەمیە، ئانکو گرێکا سەرەکی یە.

پرتا سێی دویماهیکا چیروکێ‌یە. ژڤێ چە ندێ دیار دبت کە چیروگ نڤیس خو بدەمەکیڤە نەگرێدایە بەلکی یێ ژدەمێ حازر دەست پێ کری و چو، بو دەمێ بەرێ - پازدەسالا - وجارەکا دی زڤری دەمێ نهو.

ئەڤ هەرسێ پرتە ئێگ ب ئێکێڤەیا بەند کری‌یەو ئێك رێکێ ددەتە یا بدویڤ خوڕا... ژسەرێ چیروکێ دیارە قارەمانێ چیروکێ لوێ ئێڤارێ گەلەکێ گێول نەخوش بوو گەلەك بیرهاتنێن نەخوش و کەڤن یێ دسەرێ‌دا مەخەل بوین (نەخوشی چ جارا ژبیرا مروڤی ناچن.. نەوەکی خوشی‌یا ژیێ خوشیێ گەلەکێ کورتە،...) دیسا (سوباهی جەژنا سەرێ سالێ‌یە، لڤێ ئێڤارێ وەکی هەمی ئێڤارییت جەژن و روژێت خوش بیرهاتن دبنەگلواز... مروڤ ب خەمەکا کویر دچە سییت...) ودیسا... (ئەز و خەم و بیرهاتنێت خول بەر دەرێ دێرێ دراوە ستیای بون...) .... هتد پشتی هنگی ئەو کچکا کراس رەش دیت و زانی کی‌یە... ئەڤجا یەکجار بیرهاتنێن کەڤن دلێ وی سوتن و خار لەورا پشتی ڤێ چەندێ وەکی بیرا وی‌و هەڤالێ وی یێ شەهید هاتی قەستا دێرێ کرو چونك وان شەمالکێن خویشکا شهیدی هلکرین بەلکی بیستەکێ ئەوژی دگەل بیرهاتنێن خو یێن کەڤن بژیت هەر چەندە وی هزرا هاتنا روحا « هرمز »ی نەدکر.

ئەڤ ئەگەرە هەمی‌و رویننشتنا وی بتنێ ددێرێ ڤە ب وان هزرو بیراڤە ئەم دشێین بێژین ئامادەکرنە بو خواندەڤانی‌و هزروبیرێن وی بو پرتا دوێ ژچیروکێ کو خواندەڤان پێ قایل ببت کا بوچی قارەملن چو ددێرێ ڤەو هەڤالێ زاروکینیێ « هرمز » هاتە نك وە کی خەونەکێ (تودا بێژی یێ ل سەر تبلێت خو برێڤە دچت وەسا سڤگو بێ پێژن ب نك من ڤە هات و ل دەڤ من راوەستیا...) ژڤێ پارچە منولوجي دیارە کو ئەوێ هاتی « روحە » یانژی هەلامەتێ « شبح » مروڤێ مری‌یە.

هاتنا « هرمز »ی و ئاخفتنا و نیڤبه‌را هه‌ردوا چیروکێ هه‌میێ بو مه ددانته پێش چاف و دێ زانین کا شرینای وی بوچی نه‌که‌هشت به‌ری پازده سالا ؟ !

ئه‌ڤ پرتا درێژ هه‌لبه‌ت دێ پرتا دویماهیکێ بدویف را ئێت چنکی نه‌مایه بێته گوتن... یا مای روحا « هرمز » بچته جهێ خوو دلێ قاره‌مانی بکوزرت و بسبوژت و روندکێن وی بێنه خوارێ بو هه‌ڤالێ شهید.

* * * * * * *

وه‌کی مه گوتی شرینیا سه‌رێ سالا زایینی دا « هرمز » بو هه‌ڤالێن خواندنێ ئینت که‌ئێك ژوان قاره‌مانێ چیروکێ‌یه، به‌لێ رێبه‌رێ خواندنگه‌هێ ب زوردارییا خو نه‌هێلا وی دەمی شرینی بگه‌هته بنه‌جیهێ و پشتی پازده سالا فه‌له‌کێ چه‌رخه‌گ لێدا و ئه‌و شرینی دگه‌هته قاره‌مانێ چیروکێ... به‌لێ پشتی چ ؟ نێ دیسا ڤێ جارێ ژی « هرمز » ی بخو نه‌ئینا ... خویشکا وی ئینا (بو من بێژه ڤێ جارێ کێ نه هێلا تو بینی ؟... ڤێ جارێ ژی رێبه‌ری نه‌هێلا ! ؟...)...

ئه‌رێ ما هه‌ردوو رێبه‌ر ئێکن ؟ ئه‌ز دبێژم نه ئێکن چنکی گه‌له‌ك رێبه‌رێن هه‌ین و یا دروست ئه‌وه بێژین « رێبه‌ره‌کی » نه هێلا... !

یێ ئه‌ڤ چیروکه نڤیسی بێ گومان یێ دڤان کاودانێن نه‌خوشدا ژیای ئانژی یێ ل ناڤ ته‌خه‌کا مروڤا ژیایی سه‌روبه‌رێ وان ئه‌ڤه‌بوو ئه‌ز دبێژم گه‌له‌ك زمه ژی یێ دڤان کاودانێن نه‌خوشدا ژیایی... ئه‌ڤ ژیانه نه‌گه‌له‌کا دویره ژمه و نه‌یا دویره ژ هزرا مه... بیرا مه هه‌میا دئێت دەمێ پێلاڤێن لاستیکی پێن مه دسوتن و د سه‌لخاندن ل هاڤینێ و د قه‌رساندن ژ سه‌رما و مه ژبه‌ر دگری ل زڤستانێ و هه‌که جاره‌کێ دریا بانه داچین ل مالێ (نه‌ل نك پنی دوزی) پنی که‌ین و بیرا مه هه‌میا دئێت دەیك و بابێن مه چه‌ند بزاڤ ولاڤ لاڤ دکر سه‌خمه‌راتی ژیانه‌کا پاقژ بو مه... پاری ژده‌ڤێ خو ڤه‌دگرت و دکره دده‌ڤێ مه‌دا، خو دهێلا رویس دا مه سار نه‌بایه... خو دهێلا برسی دا بشکورین ل سه‌ر لێڤێن مه نه چوبا... گه‌له‌ك ئێزا وبرو نه‌خوشی دخار ل هیڤیا وێ روژێ ئه‌و ببانه تشته‌گ و وان نه‌خوشیا خرا ژبیرێ ببه ین و ژبیرا مه بچن ئانژی خو ببه‌ین... ئه‌رێ چه‌وا دلێ وان بمه‌ڤه‌نه‌بت ئه‌ڤرو... ئه‌ڤرو... چه‌وا دلێ وان بمه‌ڤه‌نه‌بت و وان وه‌کی مێوا تری ئه‌مێ بخودان کرین و هێشتا پتر... ل هیڤیێ به‌رێ مه بخوین... به‌لێ پا ده‌یگ و بابا به‌رێ مێوا « هرمز »ی نه‌خوار چنکی ژبن هاته هلکێشان هێشتا تری بێسیره.

راستی ئه‌ڤ چیروکه مروف دشێت بێژن دو چیروکن ئێك هه‌زارایا میلله‌تێ مه ل دەمه‌کێ بوری و یا دوێ چیروکا شه‌رێ مه دگه‌ل ئیرانێ... چیروکا (جه‌نگا چه‌په‌ل).

راستی کاك « که‌ریم »ی گه‌له‌ك تشت ئینانه بیرا مه که زوێ بیرێ چو بون، بگره ژ پێلاڤێن لاستیکی و بیجامێن پاته‌کری و کری‌یا زاروکینێ ژ هه‌ژارییێ و که‌یفا زاروکینێ دەمێ پێنج فلسه‌ك دیتبا هه‌تا دگه‌هی‌یه شهید بونێ

○

---

+ (دلڤین) کومه‌له‌کا چیروکایه ڤێ دوماهیێ هاته بازاری.

ژ دیوانا دایکا گورگین

■ سەبری بۆتانی ■

ئەڤرۆ ١٦ ێ گولانا ١٩٦٦ ێ یە و سعەت ژی یازدە و بیستە..... ویَهە قەشــە پۆلسێ بێداری ل هەسپەکێ سوارە و هێدی هێدی تێت، ژ کولوسێ سەرێ وی تا پێلاڤا لنگێ وی، وەك رەنگێ هەسپێ وی رەشە.. زەلامەك ژی هێدی هێدی ل بەراهی‌یا هەسپێ وی تێت و دستــرێ.... ڤـایـە گـەهشت و ب ئـالیکاری‌یـا وی زەلامی ژ هـەسپێ خـوە دابەزی... سێ کەس، کو ئێك ژ وان چەندی تو بێژی، قەرس و نەقابیل و زمان درێژ، ل سەر لێڤا جوکا ئاڤێ روونشتی بوون، رابوون سەرخوە و قەشە ژی سلاف دا، ئو کـەیف خوەشی‌یا خوە ژی بۆ وان دیارکر، وان ژی سلاف و هاتنا وی ژدل پیروز کرن.. قەشا روونشت و ئـەو ژی روونشتن.. قەشــە ژ بـەریکـا خــوە دەڤێ هـەریـەکێ ژ وان ب شەکروکەکێ شرین کر..... گول و کولیلکێن هەزار رەنگ ب نازی و دەلالی‌یا خوە، ئەڤ چەمك و بن چیا سەرانسەر خەملاندینە، ب بـایێ‌رە درەڤسن و ب مێشــێن هنگڤینی چڤیکان‌رە دکەنن، چاڤ و دل ژێ تێرنابن.. ڤێ خەملا سپـەهی دلێ مام قـەشە قـەکر ستراند ( بەرچەم بەرچەم دچوما هەی لێ لێ هەی لۆ لۆ... ) سترانا خوە هەوکر و گوت

ببينن، ڤان، كوليلكان ببينن، برێننێ چلوا ب هەڤالتی و يەكبوونا خوە ڤی جی خوەش دكن. چ خەملەك تێر نەخش و نيگار چێ دكن... چ هونەرەك سپەهی پێشكێش دكن... لەو دبێژن: گولەك تەنێ نلكێ بهار، ما چ يە گەلۆ ئەگەر ئەم مروڤ ژی وەك ڤان كوليلكيان ببنە يەك ؟.. خوەزی يەكبوونا مە ژی وەك يا ڤان كوليلكان بوويا.. نزانم چما ئەم ژ تشتەك هوسا ڤێرنابن »

نەڤاپيلێ زمان درێژ سەرێ خوە ئێ رەق و هشك ل قەشە هەژاند و گۆت: تو ب ڤان گۆتنێن ڤالا كێ دخاپينی مام قەشە ؟... تو مە پێ دخاپينی، ئان ژی خوە ؟.... گەر وەك ئەز دبينم من ب گۆتا، پێش تو بێژی، تە ژی ئەڤ پەسنێ هيچ و ڤەلەو نەددا.. بلاسی خەبلتێ تو بكە، بهارا روومەت و كەيفێ، نەيا پەسن و فەلسەڤێ، نان و خويبوون مە دڤێتن، ئەم دێ چ كن ژ فەلسەڤێ، هەی قەشە يێ تێر و تژی. »

چريسەتێ قەشە گرت، عەجيب گرتی ما، ديت ژی كو گۆتنا ڤی و يا وی هەردوك ژی، هەريەكێ ژ رەخێ خوەڤە راستە و يا وی ملك و هيمە، لێ يا ڤی زمان درێژی سەرێ وێ هەيە و بنێ وێ نەديارە، ئو شرۆڤە ژی دڤێت هەم ژی يارۆ ب كەڤ و مهانەيە، نەكو هەڤ رسوا بكن... قەشە كو هوسا ديت، حەز نەكر گێژاهی يێ ژخوەرە چێكێ، خوە نەئانی رێزاوی، خوە سل ژی نەكر و ب نەرمی گرتێ: دەكا ئەم دەڤ ژڤێ فەلسەڤا كو ئەڤ هەسپێ من ژی بەردن لۆوۆ، ئەز دێ پرسەكێ ژتەكم.

- مادەم من تو راوەستاندی، بێژە، ژ تە پرس و ژمن بەرسڤا راست.

- ديتنا وێ پيرا پيرۆزو بێ كەس و وارژ من رە بوويە كول و كەسەر، ئەز شەيدايێ ئاخاڤتنا وێ مە، خوەزی هێژ ئەز نەمريم جارەك دی من ئەو پيرا زيرەك بديتا، ئێدی بەس.

- پيرا بدليسی ؟..

- ئەرێ ب خودێ ئەو، نەكەسەك دن.

- ئێك ئەو، ئێك ژی تو، ون هەردو وەك هەڤ حەژ تەڤز و تنازا دكن وەك هەڤ قوچمەبازن ژی، لەو تو هند خۆزی خوازێ ديتنا وێ بەرازا پيرۆزی... مەلايێ « شێوەلۆكێ » وێ دێهلا شەقلەباز دناسێ، دكۆ كوشتنا وێ تاڤ يە - حەلالە - لێ بلاوەركە مام قەشە ئەز خوە ژی وەك تە منێكارێ جڤاتا وێ و ئاشقێ بهيستنا دەنگێ وێ مە هەر دپرسم ژی، لێ من كەسەك نەديت سالوخەكێ ژێ هلدێ ئان تشتەكێ ژێ بزانێ... ئاخ پا زيرەكە ئەو پيرەژن.. دەبێژن دجوانیيا خوەدە خاپزانەك مەزن و ئاشق خور بوو، خوونا يارێن خوە ڤەدخوار... دبێژن نهۆ ژی وەك دووپشكە و كەس نەشێتێ، لخوە هشيار بە مام قەشە »

ئاخركێ قەشە نەچار بوو، رابۆ سەرخوە و گازی وی زەلامێ دگەل خوە كر: « سلێمانۆ، هەسپێ من بينە، من دەراڤەتا ڤی زمان درێژی نينە، وی بلاوەری ب گۆتنێن خوە ژی نينە، داخوازا وی بهارا زك و بن زكە.....

ژ ١٦ ێ گولانا ١٩٦٦ ێ داكەڤن وەرن ١٨

ێ ڤیرمەها ١٩٦٩ ێ...... دەراڤەك تەنگە پیرا بێ کەس ئاژوت... ئانی - - ئانی بەر ڤەفنا مام قەشە دانی... ئەو بێ شولێ زمان درێژ، ئەو ژی وێ کاڤێ وەك جنەکێ پەیدا بوو، گوتێ: چ تو ب سەرمە دە راتەقاندی؟ هەی پیرا خودێ ژێ ستاندی... چ تو ژ وێ دەشتێ ئانی ڤێ « دوزەخبەهشتێ »؟ هەی خودێ نەهشتێ... ترسێ ئان برسێ تو ئانی هەی خودێ کوشتێ، ئان چلخێ کونێلا تەیە و بلێ وێ تو راتەقاندی ب سەرمە دە؟.. دە ئیجا بمرە مانەبەسە؟ »

پیرێ تف کرێ و گوت: بلیەك رەش ئەز فراندم، ئانیم - ئانیم بەردەستێ هیچ و پووچەك وەك تە دانیم هەی کورێ وێ ماکەرێ »

ئەو پیرا ١٠٠ - ١٠٥ سالی و ئەو قەشەیێ ٨٠ - ٨٤ سالی دیسان وەك دو نەهنگان ل هەڤ روونشتن و دەڤ پێکرن.. ژ لالش راهیلانێ، تا دێرا ئەختومالێ، ژ زاکروز و شارەزور هەتا شام و شەنگالێ..... ژ چین و ماچینا هەتا چیایێ مەتینا... ژ کراسێ زەلیخێ هەتا هەیف و مەریخێ... ژ کەنیشتێ تا دێرێ، ژ دێرێ تا مزکەفتێ.... ژ بائەدرا شێخادی تا بەر دەرێ بەهشتێ.. بەر و ئاڤ و جوکرالێ، هن خوەش و هن کەرالێ... چ چیروك و چیڤانوك، چ ژی هونەر و دیروك، تشتەك نەما نەگوتن.

هەرچەند هەردو ژی - قەشە و پیرێ - تێرا خوە بیرتیژ و تێکەهشتی بوون، لێ پیرێ ژ وی زیرەکتر بوو، کو قەشە ژ پیرێ دپرسی، پیرێ بەرسڤ ددا، لێ هنەك ژ پرسێن وێ ژ قەشە بێ بەرسڤ دما.... پیرێ وەك چاوا پێش هنگێ شیابوویێ ڤێ جارێ ژی شیایێ... قەشە پچەکێ شەرم دکر چکو هەرجار پیرێ ژ وی دبر، لێ وەسا ژی چار ژ خوە نەدکر و چەند شیابا یان دەلیڤ هەبا دچو جەم... نەمازە ژێرە بوو بوو کەسەر کو هەما جارەکێ ئەو ژی زورا پیرێ ببێ.... لێ یاراست ئەوە کو ئەم بێژن: تێکەهشتنا پیرێ ئەو بال پیرێڤە رادکشاند، پیرێ ژی ئەڤ لەو شکەستنا قەشە لێ تال بوو بوو، لێ بناسێ وی بوو، نە یێ وێ، وی دەڤ دهاڤێتایێ و دەرگەهێ کەنگەشێ لەبەر ڤەدکر... جارا پاشییێ، کو ئێدی هەڤ نابینن، قەشە ب نیازا تولەستاندنێ هاتێ، پیرێ گوتی: ڤیرازییا من ئێدی وەك بەرێ ل من خوەش نایێ ». لێ قەشە بەلا خوە ژێ ڤەنەکر و گوت:

پیرێ پیرێ رەبەن دێرا منێ
شەڤ و روژێ، هەر ل بیرا منێ
زانینا من تە نینە، ژنکوکێ
زانا ئەزم هەی نەڤێرا منێ

پیرێ بیستەکێ خوە ل مام قەشە بێ دەنگ کر و پاشێ گوت: های ژ خوە هەبە، خوە شاش مەکە هەی کەشەیێ خودێ ژێ ستاندی.. کەسێ زانا پەسنێ خوە نادێ، هەی ئەز کوری تە و وێ خاچا سەرسینگێ تە بوویمو ، ئەڤ گوت و رابو چو کوزکێ ئاڤێ ژ قادێ راکر و تلخمێ درانێن خوە ژ دەڤێ خوە دەرانی و پی شوشت و تێر ئاڤ ژی ڤەخوار و تلخمێ درانێن خوە دیسان ڤەگەراندە دشەکەفتا دەڤێ خوەدە و چەند

جاھەکان دەڤێ خوە ڤەکر و مچاند و تلیـا
خوە یا شەھدێ ل ڤـەشە ھـەژاند و ئـەڤ
دینامێت پێڤە پەقاند:

ئەی کەشەیێ بێ مال و دێر
شێر ھەر شێرە چ مێ، چ نێر
چەندا، بکی، چەندا بێژی
ھەر ئەز ل ژۆرم تو ل ژێر

ڤەشە گۆت:

ژن ھەر ژنە، چ ژۆر چ ژێر
کەس ڤەت نەدیت ژن بوویە مێر
ڤاژی نەکە شۆلا خودێ
ھەی پیرا نەزان و بێ خێر

پیرێ گۆت:

کوھـ بدێرە گۆتنا من کەڤنە پیرێ
نەرەبەنا مزگەفتێ مە، نەیا دێرێ
هلۆ رابە ژ مەیدانێ ئان تشتەکێ
بێژە کو ژێ دیاربێ نیشانا خێرێ

ڤەشە پلمێ خوەکر، لێ زوو خوە چێکرڤە و زڤڕی سەر ھەمدێ بەرێ... پیرێ ب نازکی پەشیمانی‌یا خوە دیارکر، لێ مام ڤەشـەـە خوە ژبەرێ سلترکر و ئەنی‌یا خوە کـر گرێـك و گۆت :« ئەز دێ ژکی و ژچ خوە سلکم ھەی کەرۆکا دنیا شەڤاندی.

پیـرێ کـو دیت ڤـەشـە خـوە تـرش و کەمۆرکر، وێ ژی خوە نەرناند و گۆت :« ب ناھەق تەخوە سلکر و من ژی ب ناھەق ژبۆ دلێ تەی ژ رەنگێ جلێن تە، خوە پەشیمان کر، لێ مخابن تو ب خوەڤە نەچوێی »

ڤەشە دەنگ نەکـر و پیرێ گـۆتنا خـوە ئاژۆت :« گەر دپرسی تو ژپیرا بدلیسی، ترانا مەکە، لێ کو تەکر، خوە سل مەکـە، ئەز ب کوردی، نە ب ترکی دبێژم: ئەو پیرا ھەزار کەنکەنە و گرگرە حیزکرین، تو نەشێیی وێ چیز بکی »

ڤەشە شـەرم و ئەرنـا خوە ڤـەشارت و گۆت:

ھەی ماشەللا ھەی ماشەللا
کەسەك نەشێ ڤەشێ فەلا
تو ھلۆ رابە ژ مەیدانێ
ھەرە بینە شێخ و مەلا

پێری خوە کەناند و گۆت :« ها ئەڤێ ژی ببھیسە و ژ مەترانێ خوەرە بێژە.

گۆتنا کەشە کەلاشە
خەلقۆ وەرن تەماشە
ئەز دایکا « کورگێن » م
من کەشە کر شەماشە

ڤـەشـە رابـۆ سـەرخـوە و گـۆت : ژ دەستوورا پیرێ ئەز دێ چم.. پیرێ ب لەز جبەیێ وی گرت و ب دەنگەکی تژی ڤـەدر گۆتێ : مەچە، مەچە، دانیشە ئـەم خوە ژ ھەڤ خیش کن، پلشی ھـەرە و ئێدی ھـەو وەرە، چکۆ ئەگـەر تـو وەری ژی تـو من نابینی » ب نەرمی و سپەھی گۆتێ:

ـ ئەز ژ دیوانا تە تێرتابم، لێ ئەز ب شۆلم نەشێم نەچم و نەشێم نەییم ژی ھەی پیرا کـول‌ردەردا.... ھەی مـاك و دایکـا ھـەمی کوردا » ئەڤ گۆتنا ڤەشە پرل پیرێ خوەش

هات و ب کەیف و ژ دل گوّتیّ:

ـ های ژ دەڤیّ خوە هەبە ها، پیرا کەروّك مەکە ڤروّك، چاوەك دن ڤیّ گوّتنیّ نەبیّژە، هەکەنا ئەز دیّ بڤرم ،

پیریّ داوا جیەیّ قەشە بەرنەدا و ب کوّتەکی روەنشتاند و گوّت:

کەسیّ منوّ، کەشیّ منوّ

ئەزان و کیّف خوەشیّ منوّ

مامکیّ منوّ، خالکیّ منوّ

تشتەکیّ من ژ تشتانە

راسەر زوّزان و دەشتانە

گور گور دکیّ بیّ ئەزمانە

تیّ و دچیّ بیّ لنگە

گورمیّنە دنکە دنکە

تیّر روندك و بیّ چالە

نوّلا هەڤریشمیّ خالە

بیّ رواەبتان قەشە گوّت : ( هەورە ) گور گور دکیّ، کو بباراني دبارینیّ ( روندکێ )، دنکەدنکە ژی ئەڤ ڤنا بەرڤ و بروسکانە ، ئەڤە من تو گرتی. دەکا ڤیّ جاریّ زیرەك بە و ڤیّ یا من بزانە:

ـ هەکە تو ببینی، ل خوە ناکی، هەکە ل تەکن ئیّدی نابینی.

کونکوتا دلیّ مام قەشەیە، نەکو پیریّ بزانیّ چیە.. پیریّ بیّهنەکیّ هزرا خوە تیّدەکر و گوّت: ـ بخودیّ کم کەشەیوّ من نەزانی و ئەز نزانم ، قەشە خوە تیّر کەنکند و گوّت :ـ کفنە، کفنیّ تەی پیروّزە، ئەدیت چاوا من توگرتی و کوشتی، دەتو بزانی ئەز ئەزم.

قەشە بکەیف رابوّ بچیّ و پیریّ ژی بەرسالەك تیژ دسەریّ خوەدە حازر دکر کو بەلکی کفنیّ پیروز بیّ ببدرینیّ و دلیّ قەشە ژی پیّ بئیّشینیّ، لیّ قەشە دەلیف نەدا پیّ و ژ ئشەڤە ئەڤ پرس و بەرسڤیّن هیچ و هیّژا ژ وان پەیدابور.

قەشە: تەدیت ؟

پیریّ: مدیت

قەشە: تە چ دیت ؟

پیریّ: مەەویت

قەشە: ئەو چ یە ؟

پیریّ: ئەی ئەوە

قەشە: م زانی

پیریّ: تە چ زانی ؟

قەشە: م ئەو زانی

پیریّ: ئەو چ یە ؟

قەشە: ئەو ئەوە

پیریّ: وەی ڤیّ

قەشە: وای وای

پیریّ: های های

قەشە: بای بای پیریّ

پیریّ: کش کش کەشە

○

دیار دوسکی

بەری بهارا گوندێ مە ب دویماهیك هاتبا، دا مالێن مە بارکەن و بەرەف زۆما چن. زۆم ل دەف مەزارویا، جیهانەکا تایبەت بو، بەری چونا مە بو زۆمێ، ئەم ژ کەیفا تێر نەد نڤستین... رۆژ ل دویف رۆژێ مە د هەژمارتن.

هەر ل گەهشتنا مە بو زۆمێ، دا کەڤینە ناڤ مێرگێن تراشا. ل هێلینێن چویچکان تێژکێن ئەوا گەلەك ببین. پشتی چەند رۆژکا، د هەر ئێك ژ مە بتە خودانێ هندە چویچکا، یێ زیرەك با، دا بو خو هندەك تێژکێن کەوا ژی گرت... جارەکێ ئێکێ ژ من مەزنتر تێژکەوکەکا فرەکە گرت و دا من. گەلەك ب وێ دیاری یێ ئەز پێ خوشبیم و من ژ هەسپەکێ ب نرخ تر ددانا... من کرە د رکەکێ دا، ئاڤ و گەلەك توخمێن تومکی کرنە بەر... چەند رۆژا ئەز روینشتمە بەرامبەری ڤی کەوی، کونەو دمی ل ئاڤێ یان تومکی ب دەت، من نە دیت!! رۆژەکێ باپیرێ من ژ من پسیارکر، کا کەوێ من بێ چەوانە، من گوتێ کو چو ناخوت و ڤەخوت. من ژی پسیارا وی کر، کا چ تشت ژ هەمی یا پتر، کەوی د ڤێت، دا بو ب ئینم، کا ناخوت؟

باپیرێ من گوت:

- کورێ من، وی ئازادی ب تنێ د ڤێت... ئازادی ژ هەمی توکێن تو ددەیێ ب تام ترە، هەرە ئازاکە.

من کەوێ خو ژ رکێ دەرئێخست و بلندکر، ئەو فری و چو ل بەتەنەکا بەرامبەری کوێتێ مە داداو دەست ب چەرینێ کر... چاڤێ من مالێ و بو جارا ئێکێ بی من هزرا ئازادی یێ داکری.

○